یان یەریە

# دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە ئێران

وەرگێڕانی لە سویدییەوە

فایەق سەعید

# دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە ئێران


**پرۆفیسۆر یان یەرپە**

زانکۆی لوند

یارمەتیدەری پرۆفیسۆر سوننە پێرسۆن

زانکۆی یۆتەبۆری


وەرگێڕانی لە سویدییەوە

**فایەق سەعید**

پێشکەشە: بەسۆزی دایکم

ناوی کتێب: دابەشکردنی دەسەلاتەکان لە ئێران
نووسینی: پرۆفیسۆر یان یەرپە
وەرگێرانی لە سویدییەوە: فایەق سەعید
بلاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٢٥
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەلەگری: هەندرێن شێرزاد
هەلەگریی سەر کۆمپیوتەر: عەزیز عەبدولخالیق
سەرپەرشتیی چاپ: ئاورەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم ، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٤٠٥)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

ئەم کتێبەی لە بەردەستاندایە دەبوو بەشێک بووایە لە کتێبی "دابەشکردنی دەسەڵات" کە لە دیسامبەری ٢٠٠٣ دا چاپ کرا و لە بەهاری ٢٠٠٤ دا لە سوید خەڵات کرا، بەڵام لەبەر هۆیەکی تەکنیکی کە لە دەستی مندا نەبوو ئەو کارە نەکرا. ئەم بەرهەمە ناودارترین پرۆفیسۆری ئیسلامناسی سوید Jan Hjärpe بەهاوکاری لەگەڵ یارمەتیدەری پرۆفیسۆر Sunna Persson نووسیویانە و لە لایەن دەزگای SNS ی سویدییەوە لە ساڵی ٢٠٠٤ دا لە چاپێکی تازەدا بڵاو کراوەتەوە. ئەم وەرگێڕانە لەو چاپەی سەرەوە کراوە بەکوردی. ڕێز و سوپاسێکی زۆرم بۆ پرۆفیسۆری ناوبراو هەیە کە لەسەر داواکاری خۆم پێشەکییەکی تایبەتی لە مانگی مای ئەمساڵدا بۆ چاپە کوردییەکە نووسیوە. هەروەها ڕێزم بۆ کاک ئەحمەدی ئەسکەندەری هەیە کە بەکتێبەکەدا چووەوە و لە بری من ئەرکی نووسینی پێشەکییەکەی گرتە ئەستۆی خۆی.

ماوەتەوە بڵێم نووسەرەکان شەش پەراوێزیان نووسیوە کە بریتین لە پەراوێزەکانی (١، ٢، ٣، ٤، ٦، ١٣) و من بەپیتی "ن" لە پەراوێزەکانی خۆم جیام کردوونەتەوە.

فایەق سەعید

ستۆکهۆڵم ٢٠٠٤/٧/٢٠

## ئەم کتێبەکە

«دابەشکردنی دەسەڵاتەکان - کۆماری ئیسلامی ئێران» کە لە لایەن پرۆفیسۆری ئیسلامناس «یان یەرپێ» و یاریدەدەری پرۆفیسۆر «سوننێ پێرسۆن»ەوە نووسراوە بەشێکە لە کتێبێک لە ژێر سەردێڕی «سیستەمی سیاسی وڵاتانی دەرەوە». ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەیە لەسەر سیستەمی سیاسی وڵاتانی بەریتانیا، فەرانسە، ئەمریکا، ئەڵمان، ژاپۆن، ڕووسیا، چین، کینیا و تانزانیا و هەروەها ئێران کە بەتایبەت بۆ زانکۆکان نووسراوە.

یەکەم جار ساڵی ١٩٨٩ پرۆفیسۆر یان یەرپەم لە کۆبوونەوەیەکدا بینی کە خاچی سووری سوید بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر دۆزی کورد دابینابوو. لەو کۆبوونەوەدا یان یەرپێ وتارێکی بەنرخی پێشکەش کرد و سەرنجی بەشدارانی بەوە ڕاکێشا کە دوو پرسیاری ئاراستەکردن. یەکەم: بەرزترین دەسەڵاتی ئایینی تۆ کێیە؟ دووەم ئایینی فەرمی (ڕەسمی) بۆ دادەنرێت؟ هەر کەسە و بەشێوەیەک وەڵامی دایەوە بەڵام وەڵامەکەی خۆی سەرنج ڕاکێش بوو بەتایبەت بۆ کەسێکی وەکو من کە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتبووم و بەتەواوی دەمزانی دەسەڵاتی حکوومەتی ئایینی لە کردەوەدا چ ئاکامێکی لێ دەکەوێتەوە. وەڵامی پرسیاری یەکەمی ئاوا دایەوە: بەرزترین دەسەڵات بۆ هەر کەسێک سەر بەهەر ئایینێک بێت هەر خودی خۆیەتی! واتە ئەگەر دەسەڵاتێکی بەرز لە سەرەوە دابنرێت ئەوا دەبێ لە قسەی دەرنەچیت و هەر چۆنێک ئەو ئەمری کرد هەر دەبێ وا بکەیت و ئەمەش دوورە لە ئازادی و دیموکراسی و سەربەستی تاکە کەس.

وەڵامی پرسیاری دووەمیش ئەوە بوو کە ئایینی ڕەسمی لە وڵاتێک دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوانەی لە دەرەوەی ئەو ئایینە بن لە هێندێک لە مافەکانی شارۆمەندان (هاوڵاتیان) بێ بەری دەکرێن. مافی تەواو هەر بۆ

دانیشتوانی سەر بەئایینە ڕەسمییەکەیە نەک بۆ هەموو تاکەکانی وڵات.

کاتێک کاک فایەق سەعید ئاگاداری کردمەوە لە وەرگێڕانی ئەم باسە، دەستخۆشانەم لێ کرد و داواکەیم بۆ نووسینی پێشەکییەک بەخۆشییەوە قبووڵ کرد. ئەم چەشنە باس و بابەتانە بۆ کتێبخانەی کوردی زۆر پێویستن و بەتایبەت لە کاتێکدا کە خوێندکارانی کوردی زانکۆکانی دەرەوەی وڵات کەمتر خۆیان لەم بابەتانە داوە. دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامی لە ئێران، چاو خشاندنێک بەسەر ڕووداوەکانی بەتایبەت پاش ڕاپەڕینی ١٩٩١ لە باشووری کوردستان و پەیدابوونی چەندەها حیزب و ڕێکخراو و دامودەزگای ئایینی لە کوردستان و لە دەرەوەی وڵات، هەروەها ئاڵوگۆڕەکانی پاش یازدەی سێپتامبر هەموو ئەمانە پێویست بوونی لێکۆڵینەوەی بابەتیانە و قووڵ لەسەر ئایین و کاردانەوەی لە کۆمەڵگادا دەستنیشان دەکەن. فاکتەرێکی تازە کە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر کورد هەیە ئەوەیە کە پاش ڕووخانی ڕژێمی سەدام، شیعەکان بەهەموو باڵەکانیانەوە ڕۆڵێکی گرینگیان لە مەیدانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا پەیدا کردووە لە عێراق و هەروەها موسڵمانانی سوننەش بۆ بەرەنگاربوونەوەی شیعەکان و بۆ ڕاوەستان لە بەرامبەر ئەمریکا لە ناوچەکەدا کەوتوونەتە جموجۆڵێکی تایبەت. کورد بۆ دانانی ستراتیژی خۆی و گەلاڵەی داهاتووی پێویستی بەوە هەیە کە بەوردی لە ئاکامەکانی بەدەسەڵات گەیشتنی ئەم هێزە ئایینیانە بکۆڵێتەوە و پێم وایە نووسراوەکەی یان یەرپێ هەنگاوێکی گرینگە بۆ ڕوونکردنەوەی چەند لایەنێکی یاسایی، کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو کۆمەڵگایەی کە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سیاسی ئایینەوە.

پرۆفیسۆر یان یەرپێ بەحوکمی ئەوەی کە ئیسلامناسە، هەم قورئان و هەم کتێبە ئایینییەکانی دیکەی بەوردی خوێندووەتەوە و لە نزیکەوە ئاگادارە لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی ئیسلامی. زۆر جار لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی سوید وەکو لێکۆڵەر و شارەزایەک لەسەر ڕووداوەکانی جیهانی ئیسلام گفتوگۆی لەگەڵ دەکرێت. لە خودی

سـویدیش لەو بوارانەدا کـە دەگـەڕێتـەوە سـەر چۆنیـەتی باری ژیان و تێکەڵاوبوون یان هەڵاواردنی بێگانەکـان و هەروەها باسی کـەمـایەتیـیـە ئایینیـیـەکـان وەکـو پسـپـۆڕێک ڕاوێژی لەگـەڵ دەکـرێت و لە دەزگـاکـانی ڕاگەیاندنی ئەم وڵاتەدا سیمایەکی ناسراوە.

بەتایبەت پاش ڕووداوەکانی ١١ی سیپتامبر ئەوە ڕاستـیـیەکی حاشا هەڵنەگرە کە ژمـارەیەک لە لاوان و گـەنجـانی کـورد و سـەر بەنەتەوەکـانی دیکەش لە دەرەوەی وڵات ڕوویان کردووەتە ئیسـلامی سیاسی و سەرەڕای خـوێندەواری و تێکەڵاوی زۆر لەگەڵ کـۆمـەڵگای ڕۆژئاوا پەسنی توندڕەوە ئیسلامییەکان دەدەن. هەر کەسێک دڵی بۆ دوارۆژی ئەم لاوانە و هەروەها کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لێ بدات، ناتوانێت هەر تەنها بەدژایەتی کردن و لە دوورەوە نەفـرەت کـردن لە توندوتیـژی و تیـرۆریزم بەرەنگاری توندڕەوی ڕێکخراوە سیاسییە ئیسلامییەکان و ڕێبەرەکانیان ببێتەوە. بەڵکو گرینگ ئەوەیە بزانرێت هۆی ئەم ڕوو تێکردنەی لاوانی کورد و ئەوانەی دیکە چییە و ئەوە چ بۆشاییـیـەکە لە کۆمـەڵگادا کـە هێزی کـۆنخـواز و پاشکەوتووی وەها پڕی دەکـەنەوە کـە نموونەی حکوومـەت کـردنەکـەیان لە ناو تاڵـیـبـانی ئەفغـانسـتان و یان لە لای لایەنگرانی ئەوان لە کـوردسـتان و لە ئاسـیـا و ئەفریقا دەبینرێتەوە. دەبێ هەنگاوی پێشـگیرانە هەڵبگیرێت پێش ئەوەی گـەنجـەکـان بکەونە ناو داوی ڕێکخـراوە توندڕەوە ئیـسـلامـیـیـەکـانەوە. پرۆفـیـسـۆر «یان یەرپێ» لەو کـەسـانەیە کـە بەپەرۆشی دوارۆژی نەوەی تازەیە.

یان یەریە باسێکی دەوڵەمـەند لەسـەر سـێکولاریسم (عـیلمـانیـەت) دەکاتەوە و بۆ نموونە دەڵێ: «پێش مەرجی سێکولاریسم ئەوەیە کە هەموو کەس لە بەرامبەر یاسادا بەرامبەر بێت»[4]. لێرەدا باسی سوید دەکات کە لەوێ ئایین هەڵوێستەیەکی تاکە کەسە و هیچ چەشنە کاردانەوەیەکی نییە لەسەر شارۆمەندێتی (هاوڵاتی بوون) و یان جێگا و شوێنی تاکە کەس لە کۆمەڵگادا. دواتر باسی تورکیا و سیستەمی سێکولاری ئەوێ دەکات و

سەرنجێک لە یاسای بنەڕەتی میسر ئەداتەوە کە لەوێدا شەریعەت وەکو «سەرەکیترین سەرچاوەی یاسادانان» هاتووە. بەڵام پەرلەمانێکیان هەیە کە یاسا دادەنێت.

لێرەوە دەچێتە سەر باسێکی گرینگ واتە «سەربەست بوون لە هەڵبژاردنی ئاییندا» لە ئێران. نموونەی مامۆستایەکی زانکۆ دێنێتەوە کە دەبێ بەشداری نوێژی جومعە بکات نەک لەبەر ئەوەی خۆی لە ڕوانگەی ئایینەوە بەپێویستی دەزانێت بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ئەگەر نەچێت بۆ ئەو نوێژە کارەکەی لە دەست دەدات. لە ئێران مرۆڤ ناچارە سەر بەئایینێک بێت لە ئایینە ڕەسمییەکان. هەر بۆیەش باوەڕی ئایینی تاکەکانی کۆمەڵگا تۆمار دەکرێت و ئیتر لەوە دەردەچێت کە هەڵوێستەیەکی تاکە کەسی بێت! بەبۆچوونی یان یەرپێ لە وڵاتێکی وەکو ئێران «ئازادی ئایین مانای ئەوەیە کە شارۆمەندان مافیان هەیە لە بەرامبەر یاسادا جیاواز بن»! واتە کەسانی سەر بەکەمە ئایین و ئایینزاکان ڕاستە سەربەستن لە هێندێک بواری ئایینی خۆباندا بەڵام لە زۆر شتی دیکەدا دەکەونە ژێر دەسەڵات و یاسای ئایینی سەرەکی وڵاتەکە.

لە دونیای ئیسلامدا بەپێی لێکدانەوەی پرۆفیسۆر یان یەرپێ ڕەهەندەکان بەرامبەر بەیەک ڕادەوەستن: لە بواری کاروباری ئایینیدا سێکولاریسم دژ بەئیسلامیسم دەوەستێت و لە بواری لێکدانەوەی ناوەڕۆکی ئایینیدا نەریتگرایی دژ بەمودێرنیسم دەوەستێت. ئایین وەکو دانانی ڕەسم و یاسایەک دەبینرێت کە دەبێ بۆ کۆمەڵگا دابنرێت بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئایا تاکەکانی کۆمەڵگا باوەڕیان بەئایینەکە هەیە یان نا.

یاسای کۆماری ئیسلامی ئێران یەکەم یاسای بنەڕەتی نووسراوە لە جیهاندا کە لە گوێن پرۆفیسۆر یەرپێ بەکردەوە و پڕاوپڕ لەسەر بناغەی بیری ئایینی بۆ دامەزراندنی یاسا و ڕێسای کۆمەڵگا دامەزراوە و هەر

بۆیە لێکۆڵینەوە و دانە بەرباسی ئەم یاسایە گرینگییەکی تایبەتی هەیە. ئەم یاسایە تایبەتمەندی شیعەگەری هەیە و گرینگترین چەمکەکەیشی ویلایەتی فەقیهە. هەروەها ئەرکی سەرشانی دەوڵەت ئەوەیە کە بزانێ ئایا یاسای خودایی بەڕێوە دەچێت یان نا! بەواتایەکی دیکە نەک دین لە دەوڵەت جیا نییە، بەڵکو دەوڵەت بەتەواوی ئیسلامییە(١) لێرەدا جێگای خۆیەتی ئاماژە بەو ڕاستییە بکرێت کە لە ئێران نەک هەر لە ناو ڕووناکبیرانی سێکولار و لە ناو بەرەی ئۆپۆزیسیۆنیدا، بەڵکو تەنانەت لە ناو هێندێک لە توێژەران و ڕووناکبیرانی موسڵمانی بەناوبانگی ناوخۆی ئێرانیشدا لایەنگری لە جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت زۆر پەرەی گرتووە.

خاڵێکی سەرنج ڕاکێشی باسەکەی لێرەدا ئەوەیە کە ئەڵێ لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا ئەرکی پەرلەمان نەک دانانی یاسا بەڵکو تەفسیر و وەرگێڕانی ئەو یاسایانەیە کە پێشتر لە لایەن خوداوە دانراون. دیارە لەوەها سیستەمێکیشدا وەستان لە بەرامبەر یاسا و پەیڕەویی نەکردنی ئەو یاسایە وەنەبێت بەکردەوەیەکی یاسا شکێنەرانە دابنرێت بەڵکو «شەڕە لە دژی خودا» و ئەوەش تاوانێکی گەورەیە و هەر بەو پێیەش سزا دەدرێت. ئەمەیە مەترسی گەورە لەسەر ئازادی و دیمۆکراسی و مافی تاکە کەس لە کۆمەڵگای ئایین سالاردا.

یان بەڕێ لەم بەشەی کتێبەکەدا لەسەر کوردستان هیچی نەنووسیوە. هۆیەکەشی ڕەنگە ئەوە بێت کە پرسی کورد لە کوردستانی ئێران تێکەڵ بەئایین نابێت و دەکەوێتە خانەی خەباتی ئازادیخوازانە و نەتەوایەتییەوە. ڕاستە زۆربەی کوردەکان موسڵمانی سوننین بەڵام لە کوردستان شیعەش زۆرن و هەروەها خەڵکی سەر بەهەموو ئایین و باوەڕەکانی دیکەش هەن. لێرەدا پێویستە بگوترێت کە سەرەڕای ئەوەی لە مێژوودا زۆر جاران ڕێبەرایەتی بزووتنەوە نەتەوایەتییەکانی کوردستان بەدەست کەسایەتی ئایینییەوە بووە، خودی بزووتنەوە سیاسییەکانی کورد سێکولار بوون و هیچ کامیان ئامانجیان دانانی حکوومەتێکی ئیسلامی - کوردی نەبووە.

له وەرگێڕانی ئەم بابەتەدا وەرگێڕ واتە کاک فایەق لەبەر گرینگ بوونی بابەتەکە، دەقی هێندێک لە برگە و مادەکانی «قانون اساسی» ئێرانی بەفارسی نووسیوەتەوە کە ئەمەش کارێکی باشە و بەتایبەت ئەو کەسانەی فارسی تێ دەگەن باشتر لە ناوەڕۆکی باسەکە نزیک دەبنەوە.

ئەو شوێنانەی کە وشەکان بەلاتین نووسراون لەبەر ئەوەیە کە نووسەرانی بابەتەکە لەبەر ئاشناکردنی خوێنەری سویدی بەدەقی چەمکە عەرەبی و ئیسلامییەکان بەو شێوە نووسیویانە. لە کۆتاییدا دەستخۆشی دەکەم لە کاک فایەق بۆ وەرگێڕانی ئەم بابەتە بەپێزە و هیوادارم خوێنەرانی کورد کەڵکی زۆری لێ وەربگرن.

ئەحمەد ئەسکەندەری

ستۆکهۆڵم

بەهاری ٢٠٠٤

## پێشەکیی نووسەر بۆ چاپی کوردی

فارسەکان گەورەترین گرووپی نەتەوەیین لە ئێراندا و نزیکەی نیوەی دانیشتوانی وڵاتەکە پێک دێنن. فارسی زمانی فەرمی ئێرانە و لە ئیدارەکانی دەوڵەتیشدا هەر ئەم زمانە بەکار دێت. لە دوای ئەمانەوە تورک زمانەکان بەدووەمین پلە دێن و لە ناو ئەم گرووپەشدا ئازەربییەکان گەورەترین بەش پێک دێنن. تورکەکان یان تورک زمانەکان نزیکەی یەک لەسەر پێنج یا پچێک زیاتر لە دانیشتوانی ئێران پێک دێنن. بەدەر لە فارسەکان، ئازەربییەکان زیاتر لە هەموو گرووپە نەتەوەیییەکانی دیکە خۆیان لە ناو پێناسەی نەتەوەیی ئێراندا گونجاندووە یا تواندۆتەوە. بوونی هەندێ نائارامی و داواکاری دان پێدانان بەزمان و کولتووری نەتەوەیی ئازەربییەکان، هیچ لەو خۆگونجاندنەی ئەوان ناگۆڕێت. مرۆڤ دەتوانێ ئەوەش یاداشت بکات کە لە ناو ئازەربییەکانیشدا جۆرە دژایەتیکردنێکی خومەینیزم هەیە، بۆ نموونە ئەو گرووپانەی خۆیان لە دەوری ئایەتوڵڵا شەریعەتمەداری کۆ کردبووەوە و پشتیوانیان لە ڕەخنەکانی ئەو دەکرد سەبارەت بەتەفسیری خومەینی بۆ پرنسیپی ویلایەتی فەقیە. ئەم ڕەخنانەی شەریعەتمەداری بوونە هۆی ئەوەی ناوبراو چەندین ساڵ دەستبەسەر بێت. دەبێ ئەوەش یاداشت بکەین کە مەهدی بەزرگانیش کە بەئەندازەی شەریعەتمەداری بەرامبەر بەخومەینیزم ڕەخنەگر بوو، ئازەری بوو. یادکردنەوەی ساڵڕۆژی لە دایک بوونی پاڵەوانی سەدەکانی ناوەڕاست باباکس، لە قۆناغی داهاتوودا دەبێتە مانیفێستی ناسیونالیزمی ئازەری. مەحموود عەلی چێهرەگانی کە گەورەترین داکۆکیکەرە لە مافی ئازەربییەکان، ئەوڕۆکە لە واشنتۆن دەژی.

هەروەها تورکمانەکانیش تا ڕادەیەک بەگرووپێکی گەورە دەژمێردرێن. بەلوچەکان و عەرەبەکان و بەختیارییەکانیش لە گرووپە نەتەوەیییە

---

گرینگەکانی تری ناو ئێرانن.

کورد کە نزیکەی ٥٪ - ١٠٪ دانیشتوانی ئێران پێک دێنن، پێناسەیەکی کولتووری زۆر دیار و تایبەتی خۆیان هەیە کە جیایە لە پێناسەی فارسەکان، ئەگەرچی هەردوو زمانەکەش سەر بەهەمان خێزانن (زمانی هیندۆ - ئێرانی). شێوە دیالێکتی سۆرانی زیاتر لە نێو کوردی ئێراندا بەربلاوە. دەبێ مرۆڤ ئەوەش یاداشت بکات کە کورد بەڕادەیەکی زۆر زیاتر لە گروپەکانی دیکەی ئێران مۆرکی تریبالیزمیان پێوە دیارە: بنەمای خێڵەکی حیزبەکان بەبەشێکی گرینگی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دەژمێردرێ. ئەم کارەش بەڕوونی دەتوانرێ لەوەدا ببینرێت کە (بۆ نموونە) شووکردن و ژنهێنانی نێوان ئامۆزا و پورزاکاندا (یا نێوان خزمە نزیکەکاندا) بەشتێکی ئاسایی لە قەڵەم دەدرێت. هەروەها دەبێ ئەو نەریتەش یاداشت بکەین کە ژنانی کورد بەڕادەیەکی گەورە بەشداری لە ژیانی کۆمەڵگادا دەکەن.

زۆربەی هەرە زۆری کورد سوننی مەزهەبن (شافیعی)، بەڵام بەشێکی باشی کوردی ئێران شیعی مەزهەبن. سۆفیگەرایی (قادری و نەقشبەندی و ئەهلی حەق) ڕۆڵی تایبەتی خۆیان دەگێڕن.

ناسیونالیزمی کوردی (بەداواکردنی ئۆتۆنۆمی) لە عێراق و تورکیادا بەهێزە و لە سوریا و ئێرانیشدا بزووتنەوەیەکی دیارە. ژیانی کۆماری مەهاباد (١٩٤٦ - ١٩٤٧) کە بەیارمەتی شورەوی هاتە ئەنجام زۆر کورت خایەن بوو. بەڵام دەبێ ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە زۆربەی هەرە زۆری کوردی ئێران بەشدارییان لە ڕیفراندۆمەکەی ساڵی ١٩٧٩دا نەکرد کە بەمەبەستی پایەدارکردنی کۆماری ئیسلامی ساز کرا. کورد لە ساڵەکانی ١٩٧٩ و ١٩٨١دا ڕاپەڕین و شۆڕشی خۆیان ساز کرد، بەڵام لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە سەرکوت کرانەوە. لەو سەردەمەشەوە باری نائارامی لە ناوچەکانی ئەواندا لە پێناوی بەدەستهێنانی جۆرە

ئۆتۆنۆمییەک بەردەوامیی هەیە.

ناکۆکییەکانی نێوان شورای نگهبان و پەرلەمانی ئێران بەگرتنی بەهرۆز گێلانپایە، سەرۆکی دەزگای ڕاگیری دەوڵەتی لە ئۆکتۆبەری ۲۰۰۲دا دەستی پێ کرد. شورای نگهبان ئەوی بەهۆی سازدانی ڕاگیرییەکەوە تاوانبار کردبوو کە بەپێی ئەنجامەکانی ئەو ڕاگیرییە زۆربەی ئێرانییەکان پشتگیری ئەوەیان دەکرد کە دیالۆگ لە نێوان ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەرقەرار بێت. گێلانپایە بەجاسووسی تاوانبار کرا. پەرلەمان کە خۆی داوای لە گێلانپایە کردبوو بۆ ئەوەی ئەو ڕاگیرییەی بۆ ئەنجام بدات، تکای لە شورای نگهبان کرد کە واز لە داواکەی خۆیان بێنن و ئەو پرۆسەیە لە دژی گێلانپایە بوەستێنن. سەرۆک خاتەمی داخستنی ئەو دەزگایەی گێلانپایەی مەحکوم کرد. لە نۆڤەمبەری هەمان ساڵدا دوو یاسا بۆ پەرلەمان پشنیاز کران و قسەیان لەسەر کرا. لە یەکەمیاندا پێشنیازی ئەوە کرابوو کە شورای نگهبان چیتر مافی ئەوەی نەبێ بڕیاری ئەوە بدات کە کێ بۆی هەبێ یا نەبێ خۆی بۆ هەڵبژاردنەکان کاندید بکات. لە دووەمیشیاندا پێشنیازی ئەوە کرابوو کە سەرۆک کۆماریش بواری ئەوەی بۆ بڕەخسێنرێت بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو بڕیارانە هەڵبوەشێنێتەوە کە لەگەڵ یاسای بنەڕەتیدا هاودژن یا ناکۆکن. پەرلەمان لە ۱۰ی نۆڤەمبەردا دەنگی بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانی سەرۆک کۆمار دا.

خۆپیشاندانی خوێندکاران لە پێناوی بەرفراوانکردنەوەی ئازادییەکان لەم ماوەیەدا زۆر بوون. بەڵام شورای نگهبان هەموویانی سەرکوت کرد و ئامادە نەبوو واز لە دەسەڵاتەکانی خۆی بێنێ.

لە ۱۵ی مارسی ۲۰۰۳دا سەرۆک خاتەمی و سەرۆکی پەرلەمان مەهدی کەڕوبی لە گەرمەی گفتوگۆکاندا لەگەڵ شورای نگهباندا هەردووکیان کۆبوونەوەیان بەجێ هێشت. ئەم کارەی ئەوان پرۆتێستێک بوو دژ

بەخراپەکارییەکانی ڕابەرە کۆنسێرڤاتیڤەکان بەمەبەستی تێکدانی پرۆسەی ریفۆرمخوازی حکوومەت و هەروەها دژ بەزیادکردنی بودجەی شورای نگهبانیش بەڕێژەی ٥٠٪ . لە مای ٢٠٠٣یشدا خاتەمی دووبارە ڕەخنەکانی خۆی لەو ڕابەرە ئایینیانەی بەربەستیان لە بەردەم ریفۆرمدا دانابوو، دووبارە کردەوە.

لە هاوینی هەمان ساڵدا ڕیزێک خۆپیشاندان لە لایەن خوێندکارانەوە قەراری گرت، بەڵام ئەمجارەیان دژ بەخاتەمیش بوو چونکە ئەمیش سیاسەتێکی زۆر وریانۆکانەی پیادە دەکرد. لە ناوەڕاستی مانگی شەشی ٢٠٠٣یشدا ٢٤٨ ڕەخنەگری ڕژێم لە بڵاوکراوەیەکدا ئەوەیان ئاشکرا کرد کە میللەت مافی تەواوی هەیە کە ڕەخنە لە ڕابەر (عەلی خامەنەیی) و شورای نگهبان بگرێ و تەنانەت لە کاریش دەریان بکات. بەشێوەیەکی دی ئەو ٢٤٨ کەسە پشتگیرییان لەو ١٣٢ ئەندامەی پەرلەمان کرد کە داوای ریفۆرمیان دەکرد. لە سەرەتای ئەمساڵدا (٢٠٠٤) پارتەکەی خاتەمی هەڕەشەی ئەوەی کرد کە بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەماندا نەکات، چونکە شورای نگهبان ناوی ٣٦٠٥ کاندیدی لە کۆی ٨١٥٧ کاندید (کە ٨٣ کاندیدیان ئەندامی پەرلەمان بوون) ڕەت کردەوە. هەروەها لە ٢١ی جەنیوەری ٢٠٠٤یشدا تەواوی فەرماندارەکانی ئێران داوای دواخستنی هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانیان کرد. لە لایەکی ترەوە شورای نگهبان ئەوەی قبوڵ کرد کە ١/٣ی ئەو کاندیدانەی پێشتر ناوەکانیانی ڕەت کردبووەوە، بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن. لە یەکی فابریوەریدا ١٠٩ پەرلەمەنتار دەستیان لە کار کێشایەوە و شورای نگهبانیشیان بەهێنانە کایەوەی دەسەڵاتێکی تاڵیبان ئاسا تاوانبار کرد.

"حزب مشارکت اسلامی" کە لە لایەن براکەی خاتەمییەوە سەرکردایەتی دەکرا بڕیاری ئەوەی دا کە بەشداری هەڵبژاردنەکان نەکات. خامەنەییش لە لای خۆیەوە بڕیاری ئەوەی دا کە هەڵبژاردنەکان دوا نەخات بۆ کاتێکی تر. سەرئەنجام ١٢٥ پەرلەمەنتار لە کۆی ٢٩٠ دەستیان لە کار کێشایەوە.

بەڵام دواتر خاتەمی پەشیمان بووەوە هەڵبژاردنەکانیش لە ٢٠ی فابریوەریدا ئەنجامیان گرت. لەم کاتەدا شورای نگهبان ناوی ٢٥٣٠ کاندیدی (لە کۆی ٨١٥٧) ڕەت کردەوە. یەکێک لەو ناوانە ڕەزا خاتەمی بوو کە سەرکردایەتی "حزب مشارکت اسلامی" دەکرد. سێ ڕۆژ بەر لە هەڵبژاردنەکان، واتە لە ١٧ی فابریوەریدا شیرین عەبادی (وەرگری خەڵاتی نۆبێل) بڕیاری ئەوەی دا کە بەشداری هەڵبژاردنەکان نەکات. لە ١٨ی فابریوەریشدا ئەندامەکانی پەرلەمان لە نامەیەکی سەرئاوەڵادا ڕەخنەیان لە خامەنەیی گرت.

بەم شێوەیە لە ٢٠ی فابریوەریدا هەڵبژاردنەکان ساز درا بەڵام ڕێژەیەکی کەم (٥١ ٪) لە خەڵک بەشدارییان تێدا کرد. ئەم ڕێژەیە لە شارە گەورەکاندا لەوەش کەمتر بوو (لە تاران ٢٨ ٪). سەرئەنجامی هەڵبژاردنەکان وەکو شتێکی چاوەڕوانکراو بەسەرکەوتنی زۆربنەی کاندیدە "کۆنسێرڤاتیڤەکان" کۆتایی هات. بەم شێوەیە شەرعیەتی سیاسی پەرلەمان نیشانەی پرسیاری کەوتە سەر و لەسەر ئاستی درێژخایەنیشدا ئەوە دەردەکەوێ کە نەوەی نوێ ئەمڕۆ ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بەسیستمی فەرمانڕەوای ئێران دەربڕی.

یان یەرپە

پرۆفیسۆری ئیسلامناس لە زانکۆی لوند

٢٥ی مای ٢٠٠٤

# ئیسلام و خیلافەت

پەیوەندی نێوان ئایین و سیاسەت بەدرێژایی بەشێکی گەورەی مێژووی ئیسلام خۆی لە ناو دەستەواژەی خیلافەتدا بەرجەستە کردووە. زۆرینەی موسڵمانەکانی جیهان خەلیفەیان (وەک پرنسیپ) وەک بەرزترین ڕابەری ڕوحی جیهانی قبوڵ کردووە. بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینە بەزۆری لە شوێنەکانی تر و لە دەست سوڵتان و ئەمیر و فەرمانڕەواکاندا، یا لە دەست داگیرکەرە غەیرە موسڵمانەکاندا بووە.

بەشی هەرە گەورەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقا هەر لە ١٥٠٠ەکانەوە تا جەنگی جیهانی یەکەم بەلایەنی کەمەوە بەشێوەیەکی فەرمی لە ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە، هەروەها سوڵتانی عوسمانیش لە ئیستامبوڵ لە هەمان کاتدا خەلیفەیەکی سوننی بووە. ئەم خەلیفەیە لە لایەن شیعەکانەوە دانی پێدا نەنراوە، چونکە ئەوان پێیان وابوو ڕابەری شەرعی دەبێ لە دەستی ئیمامێکی خانەوادەی عەلیدا بێت. هەر لەبەر ئەمە فارسەکان لە ژێر دەسەڵاتی خەلیفەدا نەبوون و وەکو پرنسیپیش ئەویان پێ قبوڵ نەبوو. لە بەرامبەر ئەمیشدا چەندین گروپ و لایەنی لاوازی دیکە هەبوون کە هەمیشە لەگەڵ خەلیفەی عوسمانیدا دەربارەی ڕابەرێتی ئەو لە ناکۆکیدا بوون.

لە ئاستانەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا دەوڵەتی عوسمانی بەلایەنگرتنی وڵاتەکانی تەوەر بەشداری لەو شەڕەدا کرد و خەلیفە فەتوایەکی لەو بارەیەوە دەرکرد کە تێیدا ئەو شەڕەی بەجیهاد پێناسە کرد و ئەوەشی ڕوون کردەوە کە بەشداریکردن لەو شەڕەدا، تەنانەت وەکو تاکیش، بەئەرکێکی ئایینی دەژمێردرێت. نەدەکرا ئەم فەتوایە بەیەکجاری پشتگوێ بخرێت، چونکە دەبووە سەرچاوەی مەترسی بۆ ئیمپراتۆری بەریتانی و فەرەنسیش. ئەم فەتوایە بوو بەفەرمانێک بۆ ئەوەی موسڵمانەکان ڕابەرین بەرپا بکەن.

بەمەبەستی پوچەڵکردنەوەی ئەو فەتوایە، موفتیە هاوسۆزەکانی حکوومەت دژ بەو فەتوایە ئەوانیش فەتوای خۆیان دەرکرد.

ئیمپراتۆری عوسمانی کە پێشتریش خۆی زۆر لاواز بووبوو، بەهۆی سەرگرتنی هاوپەیمانێتییە ناوخۆکانەوە بەیەکجاری هەڵوەشایەوە. ئەو شکستە بووە هۆی بەرپابوونی شۆڕش لە تورکیادا. کەمال ئەتاتورک پرۆسەی سێکولاریزەکردنی دەوڵەتی پیادە کرد. تورکیا وەکو دەوڵەتێکی نەتەوەیی پێناسەکرا و ئەم پێناسەکردنەش بووە هۆی دروستبوونی چەندین گرفت لەگەڵ خەڵکی یۆنانی و ئەرمەنی و کورددا. یاسایەکی بنەڕەتی سێکولار جێگەی یاساکانی شەریعەی ئیسلامی گرتەوە و ئایینیش وەکو شتێکی تایبەت بەخودی مرۆڤەوە پێناسە کرا. واتە ئیسلام هەمان رۆڵی پێ بەخشرا کە "ئایین" لە سەرجەمی وڵاتەکانی ئەورووپا هەیەتی. بەشێوەیەکی تر تورکیا وای چاوەڕوان دەکرد بەر لە هەموو شتێکی دیکە وەکو بەشێک لە ئەورووپا تەماشا بکرێ. ئەو جلوبەرگانەی پەیوەندییان بەئایینەوە هەبوو یا ئاماژەیان بۆ ئایین دەکرد (تەربوش، سەرپۆش یا حیجاب، جلی دەروێشانە... هتد) قەدەغە کران. لە ساڵی ۱۹۲۳دا تورکیا بوو بەدەوڵەتێکی کۆماری.

خیلافەت لە ساڵی ۱۹۲٤دا لابرا. ئەم کارە بووە هۆی گۆڕانکارییەکی زۆر گەورە لە تەواوی جیهانی ئیسلامیدا. چونکە خیلافەت هەر لە دوای سەردەمی پێغەمبەرەوە ئامازەی بۆ ئەو پەیوەندییە بەردەوامە دەکرد کە لە نێوان ئایین و سیاسەتدا هەبوو. ئەو شتە پیرۆزانەی خەلیفەیان بەپێغەمبەرەوە دەبەستەوە چ جاران و چ ئێستاش لە ئیستامبوڵ دەپارێزران و دەپارێزرێن: بۆ نموونە عەباکەی، شمشێرەکەی، تیر و کەوانەکەی و تەنانەت ئەو ددانەشی کە کاتی خۆی لە شەڕی ئوحوددا کەوتبوو.

ئەمرۆ پەیوەندی نێوان ئایین و سیاسەت بەشێوەیەکی دیکە پێناسەی دەکرێ. گرفتی ڕابەر چ ئەوسا و چ ئێستاش هەر وەکو خۆی بەبێ چارەسەر

ماوەتەوە. ئەو هەولانەی لە ۱۹۲۰ و ۱۹۳۰کاندا بەمەبەستی دووبارە دانانەوەی خەلیفەیەک دران، سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. یەکێک لە هۆکارەکانی ئەو سەرنەکەوتنە ئەوەبوو کە شاری مەککە چیتر لە ژێر دەسەلاتی خێزانی هاشمییەکاندا[1] نەما بوو. حیجاز کەوتبووە ژێر دەسەلاتی خەلکانێکی ترەوە، بەواتایەکی دی دەستی خانەوادە سعودییەکانەوە.

## ڕۆڵی دەوڵەت، خێزان، ئایین

زۆربەی کۆمەڵگاکانی نێو جیهانی ئیسلامی (بەدەر لەو وڵاتە دەوڵەمەندانەی کەنداو) لە ستروکتوری کۆمەڵگایەکی خۆشگوزەران بەرخوردار نین. لە بواری گەرەنتی و دابینکردنی باری ژیان و ئاسایشی خەڵکدا دەوڵەت توانایەکی لاواز و ناچیزی هەیە. لە بواری تەندروستی و یارمەتی خەڵکدا لە کاتی نەخۆشی، بێکاری، خوێندن، بەرگریکردن لە گیان و موڵک و ماڵی تایبەت، تاکەکانی کۆمەڵگا پشت بەخێزان، خزم و کەسوکار و پەیوەستە ئایینییەکان دەبەستن. ئەم گروپانەش لە ناو کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا وەزیفەیەکی تر و ڕۆڵێکی تر دەگێڕن جیاواز لەو ڕۆڵەی لە ناو "دەوڵەتە بەهێزەکاندا" هەیانە. ئەم جیاوازییەش لە ڕێگەی خۆیەوە کار لە نۆرم و پێوەرەکان دەکات.

بۆیە تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایانە هیچ پێویستیان بەوە نییە هاوخەم و پاڵپشتی دەوڵەت بن، بەڵام پێویستە هاوخەم و پاڵپشتی ئایینی ئیسلام و خێزانەکانی خۆیان بن. بەهەمان شێوەش خێزان نەک دەوڵەت، دەبێتە ئەو تۆڕە یا ئەو پشتێنە کۆمەڵایەتییەی کە پارێزگاری لە کۆمەڵگا دەکات. لە ئەنجامی ئەمەشدا دیاردەی خزمپەرستی دێتە ئاراوە کە لە بەرژەوەندی خزم، کەسوکاری پیاو و کلێنتەکان (موالی) دایە. یارمەتیدان و بەدەنگەوە هاتنی ئەو خزم و کەسوکار و کلێنتانەی (muwali) کە بەهانای یەکەوە دەچن و پێویستیان بەیارمەتی یەکتر هەیە، بەشتێکی سروشتی و ئەرکێکی ئەخلاقی دەژمێردرێ. پەیوەندییەکانی نێوان پاترۆن و کلێنت (المولی والموالی) بەشێکی گەورەی ستروکتوری کۆمەڵگا پێک دێنێ. ئەمەیان لەم کۆمەڵگایانەدا زۆر لە دەوڵەت و سنوورەکانی دەوڵەت گرینگترە.

ژیان و زیندەگی منداڵ پابەندە بەخێزان و خزم و کەسوکارەوە، ژیان و

گوزەرانی خێزانیش پابەندە بەمناڵەوە. ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێ کە ژن و مێردایەتی "ژنهێنان و شووکردن" بەزۆری شتێکی تایبەت نییە بەخودی تاکە کەسەکانەوە وەکو لە "دەوڵەتە بەهێزەکان" هەیە. خێزان و خزم دوا قسەی یەکلاکەرەوەیان لەم مەسەلەیەدا هەیە. بۆیە دیاردەی endogamy، واتە ژنهێنان لە هەمان گۆشت و خوێن ڕەواجی خۆی هەیە: واتە پیاو هەمیشە لە نێو سنووری خزم و کەسوکار و ئایینەکەی خۆیدا ژن و ژنخوازی دەکا. بەزۆریش ئەوە بەباشتر دەزانرێ کە ژن و ژنخوازی لە نێو خزمدا (ژنهێنان و شووکردن بەئامۆزا و پورزا) بێت، یا لەو جۆرانە بێت کە ببێتە هۆی توند و تۆڵکردنی پەیوەندی خزمایەتی.

هەر کات سیستمی خانەنشینی لە وڵاتەکەدا نەبێ، پیرەکان زۆر پابەند دەبن بەبوونی منداڵەوە. لە ڕوانگەی هەر ئیندڤیدێکەوە (تاکە کەس) بوونی منالّی زۆر لە کاتی پیریدا بەشتێکی ئەقڵانی و پێویست دەژمێردرێ. بەڵام لە لایەکی ترەوە بەرزبوونی ڕێژەی لە دایک بوونی منالّ بۆتە گرفتێکی گەورە لە بەردەم گەشەسەندنی دەوڵەتەکاندا. لێرەدا دەکرێ ئێران بەنموونە بهێنینەوە کە زۆر لەمێژە ڕێژەی لە دایکبوون بەپێی ئامارە فەرمییەکان تێیدا گەشتۆتە ٣٪، بەڵام بەئەگەری زۆر لە ڕاستیدا زۆر لەوە بەرزترە.

لە کۆمەڵگایەکی ئاوادا کە بەر لە هەموو شتێ لە ڕوانگەی خزم و عەشیرەت و ئایینەوە کار دەکات، حکوومەت بریتی نییە لە چەند وەزیرێک کە نمایندەگی حیزبێکی دیاریکراو دەکا یا نمایندەگی کوالیسیۆنی چەند حیزبێکی خاوەن ئایدیۆلۆژیای دیاریکراو دەکا، کە لە پەرلەماندا زۆرینەیان هەیە و لەولاشەوە کەمینەیەکی ئۆپۆزیسیۆنێکی شەرعی هەیە. بەڵکو حکوومەت بریتییە لە هاوپەیمانێتییەکی زۆر حەساس و ناتەبا لە نێوان سەرگەورەی گروپە ئێتنیکیە سەرەکییەکاندا یا سەرگەورەی خزم و عەشیرەتەکاندا. ئەندامانی حکوومەت لەبەر ئەوە لە ناو حکوومەتدا نین چونکە لە بارەی مەسەلە ئایدیۆلۆژییەکانەوە هاوبیرن لەگەڵ ئەندامەکانی

تری حکوومـەتدا، بەڵکو لەبەر ئەوەی هەر کـەسـە و بتـوانێ بەرژەوەندی گروپەکەی خۆی بپارێزێ و هاوسەنگی لەگەڵ گروپەکانی تردا ڕابگرێ.

لوبنان نموونەیەکی زۆر ڕوونە لەم بوارەدا. بەڵام دەشـتـوانین ئامـاژە بۆ وڵاتانی شورای هاریکاری کەنداو Gulf Cooperation Council بکەین، کە سـتـروکـتـوری عـەشـیـرەتگەری و دەسـەڵاتی دەوڵـەتیـان بەخـانەوادەی پاشایەتییەوە گرێ داوە. ئەو "ئەنجومەن"ەی وەکو حکوومەتێکی گواستنەوە لە پاش شەڕ و داگیرکردنی عێراق ٢٠٠٣ دروست کرا، نموونەیەکی ڕوونە بۆ دابەشکردنی گروپەکان لەسەر بنەمای ئیتنیکی، ئایینی، عەشیرەتی و ناسنامەی گروپەکان. لەو ئەنجومەنەدا (ئەنجومەنی فەرمانڕەوایی عێراق - و) هەر گروپە و بەرژەوەندییەکانی خۆی دەپارێزێ و لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بەلانس ڕادەگرێ.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە وشەی وەک "خێزان"، "حیزبی بوون"، "ئایین" لەم کۆمەڵگایانەدا ناوەڕۆکێکی وەزیفەیی جیاوازیان هەیە لەو ناوەڕۆکەی لە کـۆمـەڵگاکـانی تری چون کـۆمـەڵگای سویدیدا هەیانە. تەنانەت ئەو حیـزبانەی کـە خاوەنی نیـشـانە و سیـمـبـۆلی ئیـدیۆلۆژیشن هیـچ جۆرە جیاوازییەکیان لەگەڵ گروپە ئیتنیکەکان یا گروپە ئایینی - ئیتنیکەکاندا نییـە. بەڵام ستروکـتوری کۆمەڵگاکان لە گۆڕاندان. لە هەمان کاتیشدا ئارەزوویەکی هۆشـمـەندانە هەیە لە "وڵاتانی سـێـیـەمـەوە بۆ وڵاتە پیـشـەسـازییـەکـان". پرۆسەی پیـشـەسـازیکردن و گـۆڕانی باری ئابووری گۆڕینی ستروکتورەکانی کۆمەڵگا بەرەو پێشەوە دەبا.

ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی پێوەر و نۆرمەکان گۆڕانیان بەسەردا بێت، پیـشە کـۆنەکـان و کـار و کـاسبی نەمێنن و هی تازە جێگایان بگرێتەوە. بەهەمان شێوەش ئینیستیتۆی تازە بێتە ئاراوە.

لە ئاسـتـانەی گـۆڕانی کـۆمـەڵگادا چ ئایین و چ خێـزانیش دەبنە گرفـتی گـەورە. مـەبەسـتـمـان ئەوە نیـیـە کـە مـرۆڤ وازیان لێ دێنێ، بەڵکو

وەزیفەکانیان و پانتایی وەزیفەکانیان وەکو جاران زۆر ڕوون نابن. ئەو شتانەی کە چیتر ڕوون و دیار نین یا ماناکانی خۆیان لە دەست داوە پێویستە شی بکرێنەوە و بەشێوەیەکی جودا لە شێوە نەریتییەکەی خۆی تێگەشتنمان بۆیان هەبێ. ئەم کارەش پێویستی بە(اجتهاد) هەیە - ئەم تێرمە گوزارش لە تەفسیرێکی تازەی ئیسلام دەکات.

ئەوڕۆ زۆر چارەسەر هەن، یەکێک لەوانە ئەوەیە کە سوید ڕۆژێ لە ڕۆژان هەڵیبژارد، ئەویش سێکولاریزەکردنی وەزیفەکانی دەوڵەت، پارێزگاکان، شارەوانییەکان و بەشێوەیەکی گشتیش سێکولاریزەکردنی "کۆمەڵگا" بوو. بەشێوەیەکی دی ئەم بوارە نوێیە بەبوارێکی مادی دەژمێردرا، واتە یەکسان بوو بەپیرۆزکردنی یا تایبەتیزەکردنی ئایین: واتە ئایین وەکو شتێکی تایبەت بەتاکە کەسەکانەوە تەماشا دەکرا و لە مەسەلەی هاوڵاتیبوون و پلە و پایە و هەڵوێستی ئەو کەسانە لە ناو کۆمەڵگادا هیچ جۆرە ڕۆڵێکی نەدەبینی. لە نێو جیهانی ئیسلامیدا تورکیا سێکولاریزمی هەڵبژارد و خستیە ناو یاسای بنەڕەتیی خۆیەوە. یەکێک لە مەرجەکانی سێکولاریزم ئەوەیە کە هەموو هاوڵاتیان، بەبێ ڕەچاوکردنی پاشخانی ئایینیان، دەبێ لە بەردەم یاسادا وەکو یەک بن. هەمان یاسا و هەمان ڕێسا وەکو پرنسیپ، بەبێ جیاوازی بەسەر هەموو کەسێکدا دەبێ پیادە بکرێت. بەم پێیە ئایین تەنها لەو مەسەلانەدا پەیوەندی بەداڕشتنی یاساکانەوە دەبێ کە لە بیروڕای گشتییەوە سەرچاوەیان گرتبێ، بەڵام سیستمی یاسایی بەتەنها بریتی نییە لەمە و ئەمەش هەموو یاسا و ڕێساکانی کۆمەڵگا پێک ناهێنێ. لە یاسای بنەڕەتی تورکیادا ئەوە قەدەغە کراوە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئاماژە بەیاسا و ڕێسا ئایینییەکان بکرێ و لە دانانی یاساکاندا سوودیان لێ ببینرێت، یا وەکو یاسایەکی دەوڵەت پروپاگەندە بۆ ئایین بکرێت. واتە یاسای بنەڕەتی تورکیا لەم بوارەدا زۆر لە یاسای بنەڕەتی سویدیش زیاتر ئایینی خستۆتە پەراوێزەوە. لە یاسای بنەڕەتی میسریدا ئاماژە بۆ یاساکانی خوا (شەریعە) دەکرێ بەڵام تەنها وەکو "سەرچاوەیەکی

سەرەکی یاسای بنەڕەتی" ئاماژەی پێ دەکرێ. واتە دەسەڵاتی یاسادانان ئەنجومەنی نیشتیمانی دەگرێتەوە و هەموو یاساکانیش (پێش کات لە لایەن خواوە) دانراون. ئەمەش بەو مانایە دێتەوە کە پرۆسەی یاسادانان بریتییە لە تەفسیری پرنسیپەکانی ئیسلام، بەمەرجێ ئەم کارە سەروەری ئەو ئەنجومەنە نەبەزێنێ کە یاساکان دادەنێ، تەنانەت لە حاڵەتێکدا ئەگەر دادگای باڵاش بەو یاسایانەدا بچێتەوە بۆ ئەوەی بزانێ کە دژ بەئیسلامن یا نا، ئەوە دەبێ ئەو سەروەرییە بپارێزرێت.

مرۆڤ دەتوانێ ڕێگاچارەیەکی تریش هەڵبژێرێ. واتە لەبری دەوڵەتێکی سێکولار کە تیایدا ئایین بکرێ بەشتێکی تایبەت بەتاکە کەسەکانەوە (تایبەتیزەکردنی ئایین)، دەتوانرێ خودی ئایین سێکولاریزە بکرێ. بەواتایەکی تر دەشێ بوترێ ئایین لە دەوڵەتێکی خاوەن تەکنیک و خاوەن سیستمێکی ڕێکخراوەیی بەرز کە بیر و بۆچوونە جیاوازەکان تیایدا گەشەیەکی زۆریان کردووە، دەکرێ ببێتە یاسای کۆمەڵگا. لە دوای شۆڕشەوە لە ئێران هەوڵ بۆ پیادەکردنی ئەم ڕێگاچارەیە درا. لە ئێران یاساکانی ئایینزای جەعفەری کە بەشێکن لە یاساکانی شەریعەی ئیسلامی - شیعی کراون بەیاسای دەوڵەت. ئەمەش بووە هۆی گەشەسەندنێکی زۆر و هاتنە کایەوەی گەلێ تەفسیری تازە لەو یاسایانەدا کە لە زۆر بواری نوێدا پیادە کران. یەکێک لەو بوارە گرفت ئامێزانە ئەو دەوڵەتە مۆدێرنەی ئێران بوو. ئەمە مانای ئەوەشی دەگەیاند کە کولتوور و سێرمۆنیە ئایینییەکان بوونە بەشێک لە پایەکانی هاولاتیبوون. مامۆستایەکی زانکۆ وەکو ئەرک دەبێ بەشداری لە نوێژی هەینیدا بکات. ئەم کارەی ئەو مەرج نییە ناواخنێکی ئایینی هەبێ بۆ ئەو، بەلام بۆ ئەوەی کارەکەی خۆی لە دەست نەدا دەبێ لەو نوێژەدا بەشداری بکات.

ئازادی ئایین لەوێ مانای ئەوەیە کە خەڵک مافی ئەوەی هەیە لە بەرامبەر یاسادا جیاواز بێت. ئەمەش مانای وایە هەر کەسێک کە ئایینێکی تری بێت بۆی هەیە بەلایەنی کەمەوە لە هەندێ ڕووەوە پەیڕەوی

له یاسا و ڕێساکانی ئایینەکەی خۆی بکات. وەکو پێویستیش زۆر پێویستە کە هەموو یەکێ سەر بەئایینێکی دیاریکراو بێت. دوور لەوەی مرۆڤ بڕوای هەبێ یا نەبێ، وەکو یاسا دەبێ سەر بەیەکێک لەو ئایینانە بێت کە مۆڵەتیان پێ دراوە و ئەم پاشخانە ئایینییەش دەبێ لە لای دەوڵەت ناونووس بکرێ. چونکە ئەم کارە یا ئایین بەشێوەیەکی گشتی لە ئێران شتێک نییە تایبەت بەتاکە کەسەکانەوە. ئایین وەکو سیستمێکی هەمەلایەن "Comprehensive system" چاوی لێ دەکرێ و لە هەمان کاتیشدا یاسای فەرمی دەوڵەت و ئەو سیستمە سیاسییەیە کە لەم ڕوانگەیەوە بەسیستمێکی تۆتالیتار پێناسە دەکرێ.

پەرەسەندنی کۆمەڵگا پێویستی بەتەفسیری نوێ هەیە. بەتایبەت ئەو کەسانەی لەم بوارە تازەیەدا کار دەکەن پێیان وایە ئەم پێویستییە شتێکی زۆر بەپەلەیە و دەبێ ئەنجام بدرێ. بۆیە هیچ سەیر نییە ئەوەی پێی دەڵێن بزووتنەوەی ئیسلامی (یا فۆندەمێنتالیستی) لە جیهانی ئیسلامیدا بەزۆری ڕەگی بنەماکانی خۆی لە نێو ئەم گروپەدا داکوتاوە. ئیسلامییەکان لە ناو یەکێتی خوێندکارانی بەشی تەکنیکی و زانستیدا زۆرینە پێک دێنن، بەڵام لە بەشی زانستە مرۆڤایەتییەکان و کۆمەڵایەتییەکاندا بەو شێوە نین. ئەمانە بۆ ئەوە هەوڵ دەدەن کە ئایین ببێتە یاسای کۆمەڵگا و سیستمی یاسایی لە وڵاتەکەدا. بەڵام لێرەدا باس لە نەریتگەرایی نییە، ئەوان نایانەوێ ئەو کۆمەڵگا کۆنەی جاران دروست بکەنەوە، بەڵکو دەیانەوێ دەوڵەت، ڕێکخراوەکانی دەوڵەت، باری ئابووری و تەکنیکیش مۆدێرن بێت.

ئەم گروپانە بەزۆری پشتگیری لە تەفسیرێکی (تا ڕادەیەک) ڕادیکاڵی ناوەڕۆکی ئیسلام دەکەن. بەڵام هۆکاری یا مافی بوونی دەوڵەت (raison dêt´r´) بەو شێوەیەی لە قورئاندا هاتووە (٣:١٠٤/١٠٠) بۆ ئەوەیە کە "الامر بالمعروف والنهي عن المنكر" بکات. ئایین شتێکی تایبەت نییە بەڵکو یاسایە و دەبێ هەموو کەس پیادەی بکا، جا کەسەکان بڕوایان پێی

هەیە یا نا ئەوەیان شتێکی ترە.

لە ڕوانگەی وەزیفەکانی ئایینەوە سێکولاریزم دژ بەئیسلامیزم دەوەستێتەوە. هەروەها لە ڕوانگەی تەفسیری ناوەڕۆکەکانیانەوە نەریتگەرایی دژ بەمۆدێرنیزم دەوەستێتەوە.

بەهەمان شێوە ستروکتوری کۆمەڵگای عەشایەری و خزمایەتی دژ بەستروکتوری دەوڵەتی مۆدێرن دەوەستێتەوە. هەروەها پێمان وایە سەرجەمی موسڵمانەکان وەکو میللەتێکی بەرفراوان (امة) دژ بەخەباتی گروپە ئیتنیکیە جیاوازەکان لە پێناوی دەوڵەتی نەتەوەیی دەوەستێتەوە. ئێمە لەم بوارەدا خەباتێک لە پێناوی ڕابەرایەتی کردن و شەرعیەتدا بەدی دەکەین.

## پاشماوە سیاسی و مێژووییەکان

محەمەد ڕەزا پەهلەوی لە ساڵی ١٩٧١دا لە پرسیپۆلیس "دەوڵەتی فارس" یادی ٢٥٠٠ ساڵەی مەملەکەتی فارسی کردەوە. کۆڕشی گەورە وەکو ڕابەری زلهێزێکی مەزن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە ساڵی ٥٢٩ پ. ز کۆچی دوایی کرد. ئەم دەوڵەتە فارسە زلهێزە ئەخمینیە (هاخامەنشیە) لە ساڵی ٣٣٦ پ. ز لە لایەن ئەسکەندەری گەورەوە دەستی بەسەردا گیرا. بەڵام لە ساڵی ٢٢٤ ز ساسانییەکان جارێکی دی دەوڵەتی فارسیان دروست کردەوە. یەکێک لە شا ساسانییەکان ناوی شاهەنشای لە خۆی نا، واتە شای شاکان. سوپای ساسانی لەسەر دەستی سوپای عەرەبی ئیسلامی لە شەڕی مەزنی ئەلقادسیە لە ساڵی ٦٣٦ - ٦٣٧دا شکستی خوارد و دواتر وڵاتی فارس ئیسلامیزە کرا، بەواتایەکی دی ئیسلام بووە ئایینی سەردەستی وڵاتەکە. بەشێکی کەمی دانیشتوانەکەش بەردەوام بوون لەسەر ئایینی کۆنی فارسەکان، زەردەشتی و هەروەها بەشێکیش لەسەر ئایینی مەسیحی و جولەکە.

دواتر سەفەوییەکان لە ساڵی ١٥٠٠دا دەسەڵاتیان گرتە دەست. یەکەمین شای سەفەوییەکان کە ناوی شا ئیسماعیل بوو، لە ساڵی ١٥٠١دا ئیسلام - شیعەی[٢] کردە ئایینی دەوڵەت. کردنی شیعە بەم شێوەیە، بەئایینی نەتەوەیی فارسەکان، بووە هۆی ئەوەی ناسیونالیزمی فارس ئامرازێکی بەهێزی بەدەستەوە بێت بۆ بەرگریکردن لە خۆی لە بەرامبەر بەشی هەرە زۆری عەرەب و تورکە سوننییەکاندا.

لە ١٨٠٠کاندا پاشا قاجارییەکان بەو لاوازییەی خۆشیانەوە دەیانتوانی ڕێگە لەوە بگرن کە وڵاتەکەیان بەشێوەیەکی فەرمی کۆلۆنیزە بکرێ، بەڵام ئیمپریالیستەکان بەهەر شێوەیەک بێت توانیان کۆنترۆڵی بەشێکی گرینگی کۆمەڵگای فارسی بکەن. لە ساڵی ١٩٠٧دا مەملەکەتی فارس

کرا بەسێ بەشەوە: ڕووسەکان بەشی باکوریان برد، شانشینە یەکگرتووەکان (بەریتانیا) بەشی باشووری ڕۆژهەلاتیان برد و لە نێوان ئەو دوو زونەشدا زونێکی نیوترالّ دامەزرا. لە سالّی ١٩١٤دا تارانی پایتەخت لە لایەن هێزەکانی ڕووسیا و شانشینە یەکگرتووەکانەوە داگیر کرا. دوای شەڕی یەکەمی جیهانی بارودۆخێکی کارەسات ئامێز لەم مەملەکەتەدا هاتە ئاراوە و دوا پاشای قاجارییەکانیش لە کودەتایەکی سەربازیدا ڕووخێنرا. ئەفسەرێک بەناوی ڕەزا خانەوە لە تیپی قازاخی ئێرانیدا توانی دەسەلات بگرێتە دەست و وازی لێ هێنرا لە سالّی ١٩٢٥دا خۆی بکاتە شای ولاتەکە و پاشناوی پەهلەوی بۆ خۆی هەلّبژێرێ. لە ماوەی دەسەلاتی تاکڕەوانەی خۆیدا ڕەزا شا هەولّێکی زۆری بۆ مۆدێرنیزەکردنی ولاتەکە دا. وەکو هەولّدانێکیش لە پێناو و بەمەبەستی پێکەوەنانی نەتەوەی ئێرانی، ڕەزا شا لە ماوەی دەسەلاتی خۆیدا ناوی دەولّەتی فارسی کرد بەئێران "ولاتی ئاریایەکان".

لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهانیدا ڕووسەکان و بەریتانیایەکان دووبارە بەشی باکور و باشووری ئێرانیان داگیر کرد و لە سالّی ١٩٤١دا ڕەزا شای دۆستی ئەلّمانیا-یان لەسەر کار لابرد. دواتر محەمەد ڕەزا پەهلەوی کوڕی ڕەزا شایان لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانا و بەر لە سالّی ١٩٥٣شدا دەسەلاتێکی سیاسی زۆر کەمیان خستە ژێر دەستییەوە. قۆناغی ١٩٤٥ - ١٩٥٣ قۆناغی ئازادی سیاسی و گەشەسەندنی ناسیونالیزم بوو لە ئێراندا. سەرۆکی بەرەی نیشتیمانی محەمەد موسەدەق لە سالّەکانی نێوان ١٩٥١ - ١٩٥٣دا کرا بەسەرۆک وەزیرانی ئێران. لە کاتی فەرمانڕەوایی موسەدەقدا کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ ئێرانی کە مولّکی بەریتانیایەکان بوو خۆمالّی کرا. بەریتانیا و ولاتەکانی تری ڕۆژئاواش بەبایکۆتکردنی نەوتی ئێران وەلامیان دایەوە. موسەدەق لە سالّی ١٩٥٣دا لە ڕێگەی کودەتایەکی سەربازییەوە کە بەیارمەتی موخابەراتی بەریتانی و ئەمریکایی ساز کرا ڕووخێنرا.

محەمەد ڕەزا پەهلەوی جارێکی دی لە ساڵی ١٩٥٣دا دەسەڵاتی گرتەوە دەست و توانی وردە وردە هەموو دەسەڵاتە سیاسییەکان بەشێوەیەکی ڕەها کۆنترۆڵ بکا. بەڵام لە چاوی خەڵکدا ئەو هەمیشە هەر وەکو "شایەکی ئەمریکی" مایەوە. ئێران لە نێوان ساڵی ١٩٠٦ - ١٩٧٩دا بەشێوەیەکی فەرمی وڵاتێکی پاشایی دەستووری بوو، بەڵام لە ڕاستیدا شا هەر لە ساڵی ١٩٥٣وە وەک تاقە فەرمانڕەوایەکی تاکڕەو لە وڵاتەکەدا فەرمانڕەوایی دەکرد. ئیلیتێکی سیاسی و ئابووری کە لە ٣٠٠ کەس پێکهاتبوو، بەپشتیوانی شاهەنشا و شاهەنشاش بەپشتیوانی ئەوان، توانیان هەموو دەسەڵاتەکان بگرنە دەست. دەسەڵاتەکانی شا لە کۆتاییدا پشتی بەو سوپا و دەزگای ئاسایشە بەستبوو کە تا دەهات تەشەنەی دەکرد. لە شەستەکانەوە ئازاردان و کوشتنی نهێنی و گرتنی خەڵک بەهۆی بیروباوەڕەوە لە ژێر دەستی دەزگای نهێنی ساواکدا لە زیادبووندا بوون.

محەمەد ڕەزا پەهلەوی لە ماوەی فەرمانڕەوایی خۆیدا کۆمەڵێ ریفۆرمی ئابووری و کۆمەلایەتی توندی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی پیادە کرد.

پڕ چەککردنی زۆر خێرای ئێران لە حەفتاکاندا، بەگوێرەی قسەی شا لە ساڵی ١٩٧٦دا، وا لە ئێران دەکات کە لە داهاتوودا ببێتە پێنجەمین وڵاتی سەربازیی لە جیهاندا. ئەم کارەش لەسەر مۆدێلی فەرەنسی یا ئەڵمانی بەڕێوە دەچوو، بەڵام بەبێ پیادەکردنی ئەو سیستەمە دیموکراسییەی لە ڕۆژئاوادا هەبوو. تەواوی پارتە سیاسییەکان، جگە لە هەوادارەکانی شا خۆی، قەدەغە کران. ئەم قەدەغەکردنە بەر لە هەموو لایەنێکی تر زیاتر زیانی بەپارتی تودەی مارکسی گەیاند. هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان لە لایەن ڕژێمەوە تێکدران. پەرلەمانی ئێران (مەجلیس) بەتەواوی لە ژێر دەسەلاتی شادا بوو. سەرۆک وەزیرەکان و حکوومەتەکان لە لایەن خودی شاوە دەسنیشان دەکران. سیستمی خوێندن و ماسمیدیاکان کە موڵکی دەوڵەت بوون، بەشێوەیەکی گشتی خەریکی پیاهەڵدان و شکۆمەندترکردنی دەسەلاتەکانی قەیسەر بوون.

خانەوادەی پەهلەوی ترادیسیۆنەکانی قەیسەر و نەریتە فارسییەکانی لە ولاتەکەدا هەلگرت. گالتەی بەئایین و شیعە - ئیسلام دەکرد و بەبەشێک لە رابردووی لە قەلەم دەدا. دواتر مزگەوتەکان بوونە بنکەیەک بۆ بلاوکردنەوەی پروپاگەندەی شۆرشگێرانە لە دژی رژێمی شا.

شۆرشی ئێران (١٩٧٨ - ١٩٧٩) بریتی بوو لە راپەرینێکی جەماوەری دژ بەرژێم و دژ بەدەسەلاتەکانی شا و یاساکانی ئەو. ئەم شۆرشە شێوەی تایبەتی گوتارەکەی خۆی لە شێوە زمان و گێرانەوەی مێژووی شیعە - ئیسلامەوە وەرگرتبوو: ئێرانییەکان بەهەمان شێوەی ئیمامی سێیەم (واتە وەکو ئیمام حوسەینی کچەزای پێغەمبەر کە لە سالی ٦٨٠دا راپەرینی خۆی دژ بەیەزید سازکرد) ئەمانیش راپەرینی خۆیان لە دژی شا سازکرد. واتە مرۆڤ دەبێ ژیانی بەخت بکات وەکو ئیمام حوسەین لە کەربەلا کردی... هتد. "شا یەزیدی ئەم سەردەمەی ئێمەیە". بۆیە شیکردنەوە و تەفسیری ئەم راپەرینە بەم شێوەیە، بەگوێرەی گوتار و جیهانبینی شیعی - ئیسلامی نموونەیەکی بالای بۆ خۆی دۆزییەوە و دواتریش شەرعیەتی دایە ئەو شۆرشە. وەک دەرئەنجامێکی ئەمە شیکردنەوەیەش پێش و بەتایبەت پاش شۆرشیش سەرکردایەتی شۆرشەکە درایە دەستی رابەرە ئایینییەکان.

دوای شۆرش یاسایەکی بنەرەتی دانرا کە تێیدا یاسایەکی ئایینی جێگەی یاسا سێکولارەکەی گرتەوە. لە ئێراندا یاساکانی ئایینزای جەعفەری وەکو یاسای ولاتەکە قبول کران و گەورەترین دەسەلاتیش (لە رێگەی ڤیتۆی شورای نگهبانەوە لە بەرامبەر پەرلەماندا) درایە زاناکان (Ulama)[٣] بۆ تەفسیرکردنی ئەو یاسایانە.

## یاسای بنەڕەتی کۆماری ئیسلامیی ئێران

یاسای بنەڕەتی ئێران کە دوای شۆڕش بڕیاری لەسەر درا لە ٢٤ی ئابانی ساڵی ١٣٥٨ی کۆچی - هەتاوی نووسراوە، بەرامبەر بە ٢٤ی ذوالحیجەی ساڵی ١٣٩٩ی کۆچی - قەمەری، بەرامبەر بە ١٥ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧٩. ئەم یاسایە بەر لە کۆتایی ساڵی[٤] ١٤٠٠ ڕاستەوخۆ بڕیاری لەسەر درا و لە ڕاپرسێکی جەماوەریدا کە هاوکات لەگەڵ هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماردا لە ساڵی ١٩٨٩ ساز کرا، پەسەند کرا. ئەم یاسایە گرنگی تایبەتیی خۆی هەیە چونکە یەکەمین یاسای بنەڕەتی نووسراوەیە کە لە پراکتیکدا پیادە بکرێ و بەتەواویش پشت بەئایین ببەستێ وەکو یاسایەکی کۆمەڵگا لەگەڵ پرنسیپەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیشدا هاوتەریب بێت. هەروەها ئەم یاسایە لایەنێکی تایبەتی تریشی هەیە کە بریتییە لە پابەندبوونی بەکاراکتێری شیعییەوە. کەواتە لە ڕوانگەی بەراوردکارییەوە جێگەی خۆبەتی ئەم یاسا بنەڕەتییەی ئێران بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوەوە.

## پرنسیپە بنەڕەتییەکانی ئەم سیستمە

خاڵە بنەڕەتییەکانی ئەم یاسا بنەڕەتییە لە پێشەکییەکەیدا خراونەتە ڕوو. لەوێدا ئەوە ڕوون کراوەتەوە کە ئەم یاسایە لەسەر بنەمای "پرنسیپە ئیسلامییەکان" بۆ "میللەتی ئیسلام" لە ئێران دارێژراوە.

مەبەستی ئەم یاسایە دامەزراندنی حکوومەتێکی ئیسلامییە لەسەر بنەمای مەنداتی ویلایەتی فەقیهە (ویلایة الفقیه). ئەمەش دواتر دەبێتە گرینگترین دەستەواژەی ئەو یاسا بنەڕەتییە. ئەمەش بەو مانایە دێتەوە کە تاقە لایەنێکی باوەڕپێکراو و شەرعی کە بۆیان هەبێ یاسای بنەڕەتی تەفسیر بکەن و ڕەوایەتی بەیاساکانی کۆمەڵگا ببەخشن خودی فوقەهاکانە، واتە زاناکانی فیقە، شارەزایانی یاساکانی شەریعەی ئیسلامی. واتە بنەماکان گوزارش لە ئیرادە و ئارەزووی خەڵک ناکات، بەڵکو گوزارش لە یاساکانی ئیسلام دەکات، واتە ئەو یاسایانەی پسپۆڕەکان (فوقەهاکان - و) تەفسیری دەکەن. ئەم بیرۆکەیە لە پێشەکییەکەدا ڕاستەوخۆ بەخومەینییەوە گرێدراوە، کە لە ڕوانگەی مێژووییەوە شتێکی دروستە. چونکە یاسای بنەڕەتی بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئەو پرنسیپانە بونیاد نراوە کە خومەینی لە شەستەکاندا لە کۆڕ و سیمینارەکانی خۆیدا باسی کردبوو، کاتێ کە ڕۆژانی تاراوگەیی خۆی لە نزیک گۆڕی ئیمام عەلی لە نەجەف بەسەر دەبرد. ئەم پرنسیپانە دواتر لە کتێبی "حکوومەتی ئیسلامی"دا چاپ کرا. ئەم کارە لە هەموو شتێک زیاتر پەیوەندی بەو تەفسیرە تازەیەوە هەبوو کە تیایدا باس لە دەستەواژەی شیعی ئامێزی "مەهدی" کرابوو.

لە تیۆلۆژی (خواشوناسی) شیعیدا دوازدە ئیمام هەن کە موفەسیری بێ هەڵە و بێ خەوشی ئایینی ئیسلامن و وەکو ڕابەرێکیش هەموو کەسێ دەبێ (ئیتاعەت)یان بکات. ئیمامی عەلی (عەلی کوڕی ئەبوتالیب) کە

سالّی ٦٦١ له کوفه مردووه، یەکەمین ئیمامی ئەوانە و هەر لەوێشەوە ناوی شیعە سەرچاوەی گرتووە (شیعەی عەلی یا "گروپی عەلی").
دوازدەیەمین ئیمامیش کە لە کۆتایی سالّی ٨٠٠ دا لە سامەڕای عێراق ون بوو ئیمام محەمەد ئەلمەهدی-یە کە تاوەکو ئێستاش (شیعەکان - و) پێیان وایە نەمردووە. ئەم ئیمامە کە (صاحب الزمان) ناودەبرێ تاوەکو ئەمڕۆش (شیعەکان - و) چاوەڕوانی هاتنەوەی دەکەن. ئیمام مەهدی تاوەکو ئێستاش زیندووە و ئیتاعەت کردنی کارێکی پێویستە. بەلاّم تاوەکو ئێستا ئەو ئیمامە دەرنەکەوتووە.

خومەینی ئەوەشی بۆ پرنسیپەکانی خۆی زیاد کرد کە تا ئیمام مەهدی "شاراوە" بێت، واتە وەکو ڕابەرێک لە بواردا نەبێ، ئەوە فوقەهاکان بۆیان هەیە وەکو ڕاوێژکاری موسلّمانەکان کار بکەن.

بەلاّم خومەینی هەنگاوێکی زیاتریشی هاویشت و وتی مرۆڤ نابێ تا دەرکەوتنەوەی ئیمام مەهدی پیادەکردنی ئیسلام و یاساکانی دەولّەت دوابخا یا ڕابگرێ وەکو ئەوەی تا ئێستا بەڕێوە چووە. تا ئەو کاتە دێ فەقیهێک یا ڕاوێژکارێک دەتوانێ وەکو والییەک Vali لە بری ئەو ئیمامە کار بکات. مرۆڤ وەکو ڕێگاچارەیەکی کاتیی دەتوانێ کۆماری ئیسلامی دامەزرێنێ.

ئەم بابەتە لە مادەی پێنجەمی یاسای بنەڕەتیدا بەم شێوەیە باسی کراوە:

«در زمان غیب حضرت ولی عصر عجل الله تعالی فرجه در جمهوری اسلامی ایران و ولایت امر و امامت امت بر عهده فقیه عادل و با تقوی، آگاه به زمان، شجاع، مدیر و مدبر است که طبق اصل یکصد و هفتم عهده‌دار آن میگردد»[٥].

ئامانجەکان لێرەدا زۆر بەرز ڕاگیراون: دەولّەت دەبێ ئەو کەش و هەوایە دابین بکات بۆ ئەوەی میللەت "بەرەو خوا بچن"، هەروەها دەولّەت لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەکیشدا دەبێ بەشێوەیەکی نەگۆڕ بەردەوامی بەشۆڕش

بدات. بەهەمان شێوەش دەوڵەت گوزارش لە سەرکەوتنی موستەزعیفەکان بەسەر "موستەکبیرەکان"دا بکات. ئەم دوو تێرمە لە زمانی قورئانەوە وەرگیراوە، کاتێ کە تیایدا کە ئاماژە بۆ هەوادارەکان و نەیارەکانی پێغەمبەر دەکرێ.

ئامانج لێرەدا دروستکردنی ئومەیەکی یەکگرتووی سەرتاسەری جیهانییە. لێرەدا ئاماژە بۆ قورئان کراوە 21: 92 (سورەتی الانبیاء، ئایەتی ٩٢ - و):

«ان هذه امتكم امة واحدة وانا ربكم فاعبدوني»

پلە و پایەی قورئان لێرەدا وەکو ئاماژە پێکردنێک بۆ یەکێتییەکی سیاسی تەفسیر دەکرێ. یاسای بنەڕەتی "ئیستیبدادی فیکری و کۆمەڵایەتی" بنبڕ دەکات. ئەم تێرمەش (ئیستیبداد - و) زیاتر ناوەڕۆکێکی تەکنیکی - شەرعی هەیە. "ئیستیبداد" مانای ئەوەیە مرۆڤ لە بری ئەوەی بەدوای یاسا و ڕێساکانی خواوە بگەڕێ، خۆی بەتەنها بڕیارەکان دەدات. بەهەمان شێوە دەکرێ سیستەمێکی دیموکراتی سێکولاریش کارەکتێرێکی ئیستیبدادی لە خۆ بگرێ یا نیشانەی ئیستیبدادی (istibdad) پێوە بێت.

لەبەر ئەوەی دانانی یاساکان (qanunguzar)[٦] دەبێ لەسەر بنەمای قورئان و حەدیسەکانی پێغەمبەر بونیاد نرابێ، بۆیە ئەمە ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە بەفوقەهاکان (پسپۆڕەکان لەم بوارەدا) دەبەخشێ. واتە ئەمانە "مەنداتیان" هەیە. هەر ئەمەشە کە پێی دەوترێت ویلایەتی فەقیه (vilayat i faqih -). بیرۆکەیەکی تیۆلۆجیانە کە هەمیشە لە شیکردنەوەی پێشەکییەکەی یاسای بنەڕەتیدا باس دەکرێ ئەوەیە ئایا خوا خۆی هەم خالیق و هەم یاسا دانەریشە یا نا. لەبەر ئەوەی خوا خۆی مرۆڤی دروست کردووە، بۆیە شتێکی سروشتییە کە لە کۆمەڵگادا یاساکانی خوا پیادە دەکرێ. بۆ نموونە پێناسەکردنی "مافە مرۆییەکانی ژنان". دەبێ یاساکانی

ئیسلامیان بەسەردا پیادە بکرێ، کە لە هەمان کاتدا هاوتەریبن لەگەڵ سروشتی ژناندا. ژنان بەپلەی یەکەم ئەرکی دایکایەتیان لەسەر شانە.

هەروەها دەسەڵاتی جەنگ دەبێ لەسەر بنەمایەکی ئیدیۆلۆژی یەکلا بکرێتەوە. ئەرکی سوپا و سوپای پاسدارانیش (pasdaran) ئەوەیە کە "لە ڕێگەی خوادا کار بکەن"، واتە شەڕی پیرۆز (جیهاد - و) بەرپا بکەن. ئەمەش بەمانای پیادەکردنی یاساکانی خوا لە سەرتاسەری جیهاندا دێتەوە.

یاساکانی خوا بەسەر کۆمەڵگادا پیادە دەکرێ. ئەم پیادەکردنەش لە ڕێگەی دەسەڵاتی یاسایی (دادوەری) و ڕاپەڕاندنەوە جێبەجێ دەکرێ. ئەمەش مانای وایە کە ئەرکی ناساندنی کولتوری ئیسلامی لەسەر شانی ماسمیدیاکانە کە دواتر کۆنترۆڵ دەکرێن.

بنەمای تیۆلۆژی یا ئیدیۆلۆژی یاسای بنەڕەتی لە مادەی دووەمی بەشی یەکەمی یاسای بنەڕەتیدا کورت کراوەتەوە. خاڵە گرینگەکانی ئەو مادەیە ئەمانەن:

تاک و تەنیایی پەروەردگار "tawhid". سەروەری خوا. سەروەری خواش مانای ئەوەیە هەر کەسێ جگە لە یاساکانی خوا هەر یاسایەکی تر پیادە بکا ئەوە بتپەرستە و شەریک بۆ خوا دروست دەکا. شتێکی ئیجبارییە مرۆڤ بخاتە ژێر دەسەڵاتی خواوە و فەرمانەکانی ئەو بەجێ بگەیەنێ. ئەمەش بەو شێوەیە تەفسیر و پیادە دەکرێ کە حکوومەت وەکو ئەرکی سەر شانی خۆی دەبێ چاودێری ئەوە بکات کە چۆن یاساکانی خوا پیادە دەکرێن(٧).

وەحی (Wahy) مانای "ئیلهامی خواییە". ئەو کەسەی گوزارش لە یاساکانی خوا دەکا و بلاویان دەکاتەوە، خواش چ وەکو خالیق و چ وەکو یاسا دانەریش دادپەروەرە. ناوەڕۆکی ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ هیچ جۆرە ناکۆکییەک لە نێوان باشترین شت بۆ مرۆڤ و پەیامی یاسا

خوداییـیەکاندا هەبێت. یاساکانی خوا لە ڕوانگەی پێناسەکردنەوە مانای "مافەکانی مرۆڤ" دەگەیەنێ.

ئیمامەت (Imamat) یا ڕابەریکردن مانای ئەوەیە هەموو دەمێ ڕابەرە یەک لە دوای یەکەکان یاساکانی خوا تەفسیر دەکەن، بۆ ئەم مەبەستەش (تەفسیری یاساکانی خوا – و) فوقەهاکان هەڵدەبژێردرێن. بنەمای وەزیفەکانی حکوومەت بریتین لە ئیجتیهادی بەردەوامی فوقەهاکان. واتە تەفسیرە تازەکانی ئایین کە لەسەر بنەمای "قورئان" و سوننەتەکانی پێغەمبەر دەکرێن. ئەم تێرمەی دواییـیە ئاماژەیەکە بۆ قسە و فەتوا و سوننەتەکانی پێغەمبەر خۆی و هەر دوازدە ئیمامەکەی تریش هەر لە ئیمامی عەلییەوە تا ئیمامی مەهدی، کە لە کاتی تەفسیری یاساکاندا دەبنە سەرچاوەیەک بۆ فوقەهاکان.

خەباتکردن دژ بەچەوسانەوە و زاڵبوونی هێزە بیانییەکان جێگای خۆی لە یاسای بنەڕەتییدا کردۆتەوە. مرۆڤ نایەوێ جارێکی دی لە دەرەوەڕا کار بکرێتە سەر بارودۆخی سیاسی و ئابووری ئێران. لەبەر ئەوە کۆمەڵێ مادە لە یاسای بنەڕەتیدا هەن کە ڕێگە لە بەشەرعیبوونی هەر جۆرە زاڵبوونێکی لەو جۆرە دەگرن.

یاسای بنەڕەتی پڕە لەو جۆرە وشە و دەستەواژانەی کە گوزارش لە بڕوابوونێک دەکەن بەم سیستمە تیۆکراتە کە گوایە دەبێتە هۆی هێنانەدی کۆمەڵگایەکی خۆشگوزەران کە تیایدا سەرجەمی خەڵک لە خوێندن و ئاسودەگی کۆمەڵایەتی و... هتد بەرخوردار دەبن. بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ ئەوەش بزانین ئەم یاسای بنەڕەتییە دەسەڵاتە چارەنووسسازەکان لە دەستی چەند کەسێکی زۆر کەمدا کۆ دەکاتەوە. یاساکانی دەوڵەت لەسەر بنەمای سەروەری گەل بنیاد نەنراوە، بەڵکو لەسەر یاساکانی خوا بنیاد نراوە کە بەهیچ شێوەیەک ئازادی سازدان و دروستکردنی ڕای گشتی بەشەرعی نازانێ.

ئامانجی یاسای بنەڕەتی دروستکردنەوەی ئێران نییە. بەڵکو بەو پێیەی ئاماژەی بۆ کراوە کۆماری ئیسلامی ئێران دەبێ ببێتە مۆدێلێک بۆ ئەو (امة) جیهانییەی کە هەیە. ئەمەش لەو پرنسیپەوە سەرچاوەی ناگرێ کە دان بەسەرورەری ولاتە جیاوازەکاندا دەنێ. ڕۆڵی هەرە سەرەکی و چارەنووسساز لە تەواوی ستروکتورەکانی ئەم سیستمە لە دەست (شورای نگهبان) دایە کە وەکو هاوشێوەی دادگای دەستووری کار دەکات.

## سیستمی سیاسی لە چوارچێوەی یاسای بنەڕەتیدا

### شورای نگهبان

پێکهاتەی شورای نگهبان و دەسەڵاتەکانی لە مادەی ٩١ - ٩٩ی یاسای بنەڕەتیدا[٨] باس کراوە. ئەم ئەنجومەنە لە شەش فەقیە، واتە شەش پسپۆڕی زۆر بەتوانا لە یاساکانی ئیسلام پێکهاتووە. شەش کەسی تێگەیشتوو لە "زەمان و مەکان" کە توانای ئەوەیان هەبێ تەفسیرێکی نوێی ئەوتۆ بۆ ئایین بکەن کە بشێ بۆ ئەوەی لە ناو دەوڵەتێکی مۆدێرندا ببێتە یاسای کۆمەڵگا. ئەم شەش کەسە لە لایەن ڕابەرەوە (بەفارسی رهبر - و) یا ئەنجومەنی ڕابەرییەوە دەسنیشان دەکرێن، واتە ئەو کەسە یا ئەو کەسانەی بەپێی مادەی پێنجەمی یاسای بنەڕەتی دەسنیشان دەکرێن کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

هەروەها شەش یاسازانیش لە شورای نگهباندا ئەندامن. ئەم شەش یاسازانە کە لە یاساکانی ئیسلام و فیقهدا پسپۆڕن، لە لایەن بەرزترین ئەنجومەنی یاساییەوە لە نێو "یاسازانە موسڵمانەکان"ەوە هەڵدەبژێردرێن و پەرلەمانیش دواتر پەسەندیان دەکات.

شورای نگهبان لە بەرامبەر بڕیارەکانی پەرلەماندا مافی ڤیتۆی هەیە. واتە هەموو یاسایەکی پەسەندکراو لە لایەن پەرلەمانەوە، دەبێ شورای نگهبان پێیدا بچێتەوە. هەر کاتێ شورای نگهبان پێی وابوو ئەو یاسایە لەگەڵ پرنسیپەکانی یاسای بنەڕەتی یا ئیسلامدا ناکۆکن وە دووبارە یاساکە دەگەڕێتەوە بۆ بەردەستی پەرلەمان.

زۆربنەی ئەو شەش ئەندامەی یەکەم (واتە شەش فەقیهەکە - و) بڕیاری ئەوە دەدەن کە یاساکە لەگەڵ ئیسلامدا ناکۆکە یا نا. هەروەها زۆربنەی ئەو شەش ئەندامەی دووەم (ئەو شەش یاسازانە - و) بڕیاری ئەوە دەدەن کە

یاساکە لەگەڵ یاسای بنەڕەتیدا ناکۆکە یا نا.

دەسەڵاتی تەفسیرکردنی یاسای بنەڕەتی و سەرپەرشتیکردنی هەڵبژاردن و ڕاپرسە جەماوەرییەکان لە ژێر دەستی شورای نگهبان دایە. بەهەمان شێوەش دەسەڵاتی ڕەتکردنەوەی ئەو پاڵێوراوانەی کە خۆیان بۆ هەڵبژاردنەکان کاندید دەکەن لە دەستی هەمان شورا دایە.

لە ماوەی دە ساڵی یەکەمی تەمەنی کۆماری ئیسلامی ئێراندا زۆر ناکۆکی لە نێوان شورای نگهبان و پەرلەماندا هاتنە ئاراوە، بەتایبەت لە بواری سیاسەتی ئابووریدا. بەشێوەیەکی گشتی پەرلەمان پێشنیازی سیاسەتێکی ئابووری چەپڕەوانەتری کرد و دەیویست ریفۆرمی زەویوزار ئەنجام بدات. شورای نگهبان دژ بەو ریفۆرمە بوو چونکە ئەمە ناکۆک بوو لەگەڵ مافی موڵکایەتی لە ئیسلامدا. لە ڕوانگەی بیر و بۆچوونێکی پراگماتیانەوە تەگەرە خرایە بەردەم هەندێ ریفۆرمی زۆر پێویست. بۆیە هیچ سەیر نەبوو لە ریفۆرمی یاسای بنەڕەتی ساڵی ١٩٨٩دا هەندێ لە دەسەڵاتەکانی شورای نگهبان کەم کرانەوە. دوای ئەوەی هەوادارەکانی ریفۆرم بوونە زۆرینە لە پەرلەماندا و ناکۆکییەکان دەستیان بەپەرەسەندن کرد.

## ڕابەر

ئێمە پێشتریش مادەی پێنجەمی یاسای بنەڕەتیمان بەنموونە هێنایەوە و باسی لێکدانەوە تایبەتییەکەیمان کرد لە بارەی ئیمامەت و مەهدیەوە. "ویلایەتی فەقیە" لە یاسای بنەڕەتیدا ئینستیتیونالیزە کراوە بۆ "ڕابەر"ی دەوڵەت. بەپێی مادەی ١٠٧ی یاسای بنەڕەتی(٩) خومەینی وەکو مەرجەع marjá (ڕاوێژکاری ڕوحی) و وەکو ڕابەریش rahbar لە لایەن زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەوە دانی پێدا نراوە و بەپێی ئەمەش مەنداتی ئەوەی پێ دراوە وەکو ویلایەتی مەرجەع vilayat - i amr دەسەڵاتەکانی لە سەرووی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بێت. بەپێی فۆرمی ئەو مادەیەی کە لە ساڵی ١٩٧٩دا داڕێژراوە دەبێ هەڵبژاردنێکی هەرەمەکی بۆ دیاریکردنی فەقیهێک ئەنجام بدرێ. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو مادەیە باس لە شێوەی ئەنجامدانی ئەو هەڵبژاردنەش دەکات. لە حاڵەتێکدا ئەگەر هەڵبژاردنی ئەو فەقیهە نەکرا ئەوە کۆمیتەیەکی پسپۆڕ expert commetté (بەفارسی مجلس خبرگان - و) دەتوانێ ڕابەر دەسنیشان بکات. ئەو کۆمیتەیە ڕابەرێک لە نێو فوقەها بەتواناکاندا دەسنیشان دەکات، ئەگەر ئەمەش نەکرا ئەوە کۆمیتەکە ئەنجومەنێکی ٣ - ٥ کەسی هەڵدەبژێرێ کە هەمان دەسەڵات و وەزیفەی ڕابەریان هەیە. دواتر کۆمیتەکە بەشێوەیەکی فەرمی دان بەو هەڵبژاردنەدا دەنێت. بەپێی ئەم شێوە پرۆسەیە عەلی خامەنەیی لە دوای مردنی خومەینیەوە لە ساڵی ١٩٨٨دا بۆ پۆستی ڕابەر هەڵبژێردرا. ئەو ٨٦ فوقەهایەی لەو کۆمیتە پسپۆڕەدا بۆ ماوەی ٨ ساڵ ئەندامن دەبێ تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٨ بێنە هەڵبژاردن.

هەروەها لە یاسای بنەڕەتیدا ئەوەش ڕوون کراوەتەوە کە کەسی ڕابەر (یا ئەنجومەنی ڕابەران) دەبێ خاوەنی چ جۆرە تایبەتمەندێتییەک بن. ئەو کەسە یا ئەو کەسانە دەبێ خاوەنی زانست و زانیاری پێویست و کەسایەتییەکی

ئارام و تەقوادار بن بۆ ئەوەی بتوانن فەتوا دەربکەن fatwa (کۆ: فتاوی) و وەکو مەرجەعێکی ڕوحیش کار بکەن. بەهەمان شێوە ئەو کەسە/کەسانە دەبێ بەڕادەیەک "ئازا، دلێر، بەهێز، خاوەنی بیر و بۆچوونی سیاسی و کۆمەلایەتی و کارا بن کە شایەنی پلەی ڕابەر بن".

بەپێی یاسای بنەڕەتی ١٩٧٩ خودی ڕابەر ئەم دەسەلاتانەی خوارەوەی هەیە:

* فوقەهاکانی ئەندام لە شورای نگهبان و بەرزترین ئیدارە یاسایی یا قەزاییەکان دیاری دەکا.

* هێزە چەکدارەکان لە ژێر دەسەلاتی ئەو دایە: واتە ڕابەر فەرماندە گەورەکان و سەرۆکی سوپای پاسداران دادەمەزرێنێ و لەسەر کاریش لایان دەبا.

* بەهەمان شێوە ئەنجومەنی بەرگری نەتەوەیی ئۆرگانیزە دەکات و سەرۆکی/فەرماندەی هەر سێ هێزە سەربازییەکە (هەوایی، زەمینی و دەریایی - و) دیاری دەکا.

* دەسەلاتی فەرمی هەیە کەوا جەنگ ڕابگەیەنێ و هێزە سەربازییەکان/سوپا مۆبیلیزە بکا.

* دوای هەلبژاردنی سەرۆک کۆمار، دەسەلاتی پەسەندکردنی ئەو لە دەستی ڕابەر دایە. هەروەها لە پەسەندکردنی کاندید/کاندیدەکانی سەرۆک کۆمار و لە بڕیاردان بەسەر توانا و تایبەتمەندێتییەکانی ئەو کاندیدانەدا، ڕابەر قورساییەکی چارەنووسسازی هەیە.

* دوای پێشنیازکردنی دادگای بالا یا پەرلەمان، ڕابەر دەسەلاتی دەرکردنی سەرۆک کۆماری هەیە.

بۆ نموونە خومەینی لە کاتی خۆیدا بەنی سەدری سەرۆک کۆماری بەم شێوەیە لە کار دەرکرد.

* دوای پێشنیازکردنی دادگای باڵا ڕابەر دەسەڵاتی بەخشین و لێبووردنی هەیە[١٠].

بەکورتی، ڕابەر دەسەڵاتی یاسا دەرکردن و ڕاپەڕاندن و دادوەری کۆنترۆڵ دەکا. بەڵام ئەگەر ڕابەر توانای ئەوەی نەبێ کارەکانی خۆی ئەنجام بدات ئەوە مجلس خبرگان دەسەڵاتی ئەوەی هەیە لەسەر کار لای ببا.

دەبێ ئەوەش یاداشت بکەین ئەو پلە و پایە دەگمەنەی ڕابەر لە ناو یاسای بنەڕەتی ئێراندا هەیەتی (هەر وەکو ئاماژەمان بۆ کرد) دەبێ لەو ترادیسیۆنە شیعیە تایبەتانەوە سەرچاوەی گرتبێ کە لە ئێراندا ئینستیتیونالیزە کراوە. لەو ڕەشنووسانەی/گفتوگۆیانەی لەسەر "دەستووری ئیسلامی" لە جیهانی ئیسلامیدا نووسراون یا کراون (بۆ نموونە لە دێباتەکان و کارەکانی یاسای بنەڕەتی پاکستان) شتێکی هاوشێوەی مەجلیسی نیگابان (شورای نگهبان) هەبووە، بەڵام دەسەڵاتەکانی بەئەندازەی دەسەڵاتەکانی شورای نگهبانی ئێران مەزن و چارەنووسساز نەبووە.

پلە و پایە و دەسەڵاتەکانی خومەینی ئەوەی دەگەیاند کە تا خۆی لە ژیاندا مابوو پۆستی سەرۆک کۆمار زیاتر وەکو دیکۆر وابوو. دەبێ ئەوەش یاداشت بکەین ئەم بوارەش لە کاتی داڕشتنەوەی یاسای بنەڕەتیدا کە لە ساڵی ١٩٨٩ ئەنجام درا هەندێ گۆڕانکاری بەسەردا هات.

دەستەواژەی ویلایەتی فەقیە و تەفسیری مادەی پێنجەمی یاسای بنەڕەتی لە ساڵی ١٩٩٧دا بووە مایەی جەدەلێکی زۆر گەورە لە نێوان عەلی خامەنەیی ڕابەر و ئایەتوڵڵا حوسەین عەلی مونتەزەری لە قوم. مونتەزەری (کە پشتیوانی لە محەمەد خاتەمی دەکرد کە لە ساڵی ١٩٩٧دا بەسەرۆک کۆماری ئێران هەڵبژێردرا) لە گوتارێکی بەناوبانگی خۆیدا ئەوەی ڕاگەیاند کەوا ڕابەر مافی ئەوەی نییە تاکڕەوانە بڕیارەکان بدات، بەڵکو دەبێ لەبەر ڕۆشنایی بڕیاری جەماوەردا ئەو کارە بکات.

بەهەمان شێوە ڕابەر مافی ئەوەی نییە دژ بەڕای یا دەنگی جەماوەر بێت کە لە هەڵبژاردنەکاندا گوزارشی لێ دەکات، چونکە ئەم کارە دژ بەپرنسیپی کار و دەسەڵاتەکانی مەرجەعە. شەرعیەتی مەرجەع لەوەدایە کە جەماوەر بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەرک بەتوانا و لێهاتوویی ئەو بکەن و پەسەندی بکەن. بەشێوەیەکی دی ڕابەر دەسەڵاتی ئەوەی نییە وەکو پاشایەک بڕیار بدات.

لەم بوارەدا مونتەزەری بەبەڵگەوە دەیتوانی ئەوە بسەلمێنێ کە خودی خۆی بوو پرنسیپی ویلایەتی فەقیهی لە ئاستانەی شۆڕشدا دارشت. هەروەها ئەوەش ڕوون بوو کە قبوڵکردنی خامەنەیی وەکو مەرجەعی تەقلید - marjá i taqli´d لە لایەن تەواوی کەسایەتییە ئایینییە دان پێ دانراوەکانی ئێرانەوە بەئاسانی پەسەند نەکرا. گوتارەکەی مونتەزەری جۆرە نائارامییەکی خستە نێو شاری قومەوە و لە لایەن خامەنەییشەوە بەتوندی مەحکوم کرا و خرایە ژێر پرسیارەوە. هەروەها خامەنەیی گومانی ئەوەشی لێ کرد کە گوتارەکەی لەوانەیە بچێتە ژێر خانەی خیانەتەوە و کار بگاتە تاوانبارکردنی مونتەزەری.

بەشێوەیەکی دی دەتوانین بڵێین مونتەزەری لایەنی سەرۆک خاتەمی و ڕای جەماوەری گرت. هەروەهار سیمبۆلی لیبرالیزەکردنی ئێرانی لە هەڵبژاردنی خۆیدا بەدی دەکرد.

## پەرلەمان

بەپێی یاسای بنەڕەتی دەسەڵاتی یاسادانان لە دەستی پەرلەمان، مەجلیسی شورای ئیسلامی دایە (بەفارسی مجلس شورای اسلامی - و). ئەم ناوە majlis - i Shura - yi Islami ئاماژەیەکە بۆ قورئان 42:38/36 (سورەتی الشوری، ئایەتی 36 - 38 - و)، کە تیایدا باس لە خواناسەکان کراوە کە گوایە ئەوان:

"والذین استجابوا لربهم واقاموا الصلوات وامرهم شوری بینهم ومما زرقناهم ینفقون"

تێرمی ناو ئەو دەقەی سەرەوە "شورا" شەرعیەت بەپەرلەمان دەبەخشێ، بەڵام بەهیچ شێوەیەک باس لە سەروەری دەسەڵاتی یاسادانان ناکات. یاساکان، واتە یاساکانی خوای پەروەردگار خۆیان هەر هەبوون و دەبێ پیادە بکرێن.

سەرجەمی یاساکان؛ یاسا مەدەنییەکان، یاساکانی سزا، یاسا ئابوورییەکان، ئیدارییەکان، کولتوورییەکان، میلیتارییەکان و سیاسەکانیش "وەکو هەموو یاسا و ڕێساکانی تریش" دەبێ لەسەر بنەمای "میتۆدی ئیسلامی" دابڕێژرێن (مادەی چوارەمی یاسای بنەڕەتی)[١١]. هەروەها لە هەمان مادەدا ئەوە هاتووە کە ئەم پرنسیپە لە سەرووی هەر هەموو پرنسیپەکانی ترەوەیە. تەفسیرکردنی مانای ئەم پرنسیپە کە ڕۆڵێکی چارەنووسساز دەبینێ لە دەستی شورای نگهبان دایە.

مادەی ١٢ی یاسای بنەڕەتی[١٢] زۆر گرینگە: لەم مادەیەدا ئەوە هاتووە کە ئایینی din فەرمی ئێران ئیسلامە و ئایینزاکەشی Madhhab[١٣] جەعفەرییە. هەروەها ئەوەش هاتووە کە "ئەم مادەیە هەتا هەتاییە و ناگۆڕێت". ئەمەش مانای ئەوەیە نەریتی شیعی ئیسلامی بەم شێوەیەی کە

داڕێژراوە (لە پرنسیپدا دوور لە ویستی جەماوەر و دوور لە بیر و بۆچوونەکانی پەرلەمانیش) دەبێتە یاسای وڵاتەکە.

کاری پەرلەمان لە باشترین حاڵەتدا تەفسیرکردنی یاساکانە نەک دانانیان. یاساکان بەر لەوەش خۆیان هەر هەبوون، بەڵام هەمیشە/هەموویان ڕوون نین. ئەرکی ڕوونکردنەوەی ئەو یاسایانە و داڕشتنی یاسا و ڕێسا پێویستەکانی تر دەکەوێتە ئەستۆی پەرلەمان. بەڵام ئەم کار و ئەرکانە لە ژێر ڕەحمەت و ڤیتۆی شورای نگهبان دایە و پیادەکردنی ئەو یاسایانەش بێ مەرج نین (بڕوانە ئەم بەشەی خوارەوە).

ئەو یاسایانەی لەم حاڵەتە بەدەرن ئەوانەن کە پەیوەندییان بەئایینزاکانی ترەوە هەیە. واتە ئەوانەی پەیڕەوی لە ئایینزای حەنەفی، شافیعی، مالیکی، حەنبەلی یا زەیدی دەکەن دەتوانن لە بواری نەریتە ئایینییەکان، خوێندن، خێزان و میراتدا ڕیزپەڕی بکەن. ئەم مامەڵە یاساییە تایبەتە لە دادگاکانیشدا دانی پێدا نراوە. مامەڵەیەکی یاسایی تایبەتی دیکەش (بەڵام سنووردارتر) لەگەڵ هەر سێ کەمینە ئایینییەکانی تردا (زەردەشتییەکان، جوەکان، کریستەکان) پیادە دەکرێ. ئەمانەش بۆیان هەیە نەریتە ئایینییەکانی خۆیان پیادە بکەن و پەیڕەوی لە ڕێسا ئایینییەکانی خۆیان لە بواری "وانە وتنەوە و شتە شەخسییەکاندا" بکەن. بەدەر لەم حاڵەتانە دەبێ یاساکانی ئیسلامی جەعفەری پیادە بکەن.

دەبێ ئەوە بزانین کە ئەم مامەڵە (ستاتوە) یاساییە تایبەتە تەنها (جگە لە ئیسلام) بۆ ئەو سێ ئایینە دان پێ دانراوانەیە. ئایینەکانی دیکە لە ئێراندا قەدەغەن. ئەم حاڵەتە بووە هۆی بار قورسی بۆ (بۆ نموونە) ئێرانییە بەهاییەکان کە هیچ جۆرە ستاتویەکی یاساییان لە ئێراندا نییە. ئەمانە وەکو موسڵمان یا ئیسلام ناونووس دەکرێن.

هەوادارەکانی ئەم سێ ئایینە دان پێ دانراوانە لە پەرلەماندا نمایندەگی خۆیان هەیە. واتە یەک نمایندەی زەردەشتی، یەک نمایندەی جولەکە و یەک

نماینده‌ش بۆ ئاسوری و کلدانییه مه‌سیحییه‌کان (به‌یه‌که‌وه)، دوو نماینده‌ش بۆ ئه‌رمه‌نییه مه‌سیحییه‌کان له په‌رله‌ماندا هه‌ن[١٤]. ئه‌مانه به‌جیا هه‌ڵده‌بژێردرێن. مافی ده‌نگدان بۆی نییه سنووری ئایینه‌کان ببه‌زێنێ[١٥].

ئه‌ندامه‌کانی په‌رله‌مان له هه‌ڵبژاردنێکی سه‌راسه‌ری و نهێنیدا هه‌ڵده‌بژێردرێن، به‌ڵام کاندیده‌کان ده‌بێ کۆنترۆڵ بکرێن و په‌سه‌ند بکرێن، به‌ر له هه‌موو شتێکیش ده‌بێ توانا و لیاقه‌تی ئایینی پێویستیان هه‌بێ. ژماره‌ی ئه‌ندامه‌کانی په‌رله‌مان ٢٩٠ ئه‌ندامن که بۆ ماوه‌ی ٤ ساڵ هه‌ڵده‌بژێردرێن. ئه‌ندامه‌کان سوێندێکی تایبه‌ت ده‌خۆن که تێیدا په‌یمان ده‌ده‌ن پیرۆزیی ئیسلام بپارێزن و به‌رگری له یاسای بنه‌ڕه‌تی بکه‌ن. په‌رله‌مان بۆی نییه هیچ یاسایه‌ک ده‌ربکا که له‌گه‌ڵ ئیسلام و یاسای بنه‌ڕه‌تیدا ناکۆک بێت. ئه‌م کاره دواتر له لایه‌ن شورای نگهبانیشه‌وه جارێکی دی کۆنترۆڵ ده‌کرێ. په‌رله‌مان ڕۆڵێکی گه‌وره‌ی له‌و پرۆسه‌یه‌دا هه‌یه که له‌به‌ر ڕۆشناییدا ئێران ده‌بێ بتوانێ وه‌کو وڵاتێکی هاوچه‌رخ یا نوێ کار بکات.

به‌واتایه‌کی دی په‌رله‌مان هێزێکی بزوێنه‌ره له مه‌سه‌له‌ی ئیجتیهاد ij-tihad یا ته‌فسیری نوێی یاساکانی ئیسلام که بۆ خۆی مه‌سه‌له‌یه‌که ده‌بێ به‌رده‌وام بێت.

هه‌روه‌ها له ناو په‌رله‌ماندا کۆمه‌ڵێ توانا و لێهاتوویی ته‌کنیکی و ئیداری هه‌ن که له ناو شورای نگهباندا نابینرێن.

ده‌بێ ئه‌وه‌ش یاداشت بکه‌ین که هه‌ڵبژاردنه‌کانی په‌رله‌مان هه‌ڵبژاردنی شه‌خسین نه‌ک حیزبی (واته جه‌ماوه‌ر تاکه که‌س هه‌ڵده‌بژێرێ نه‌ک حیزب - و). به‌دانانی یاسای بنه‌ڕه‌تی ورده ورده هه‌موو حیزبه‌کان هه‌ڵوه‌شێنرانه‌وه. هه‌ڵبژاردنه‌کان شه‌خسین و ناکرێ ئه‌ندامێکی په‌رله‌مان جێگاکه‌ی خۆی بداته یه‌کێکی تر. ده‌وڵه‌تی ئێران وه‌کو ده‌وڵه‌تێکی "ئیدیۆلۆژی" پێناسه ده‌کرێ و جه‌ماوه‌ر ده‌رفه‌تی ئه‌وه‌ی نییه هه‌ڵبژاردن له نێوان ئیدیۆلۆژیه جودا

جوداکاندا بکات، چونکه ئایدیۆلۆژیا هەر یەکێکە و "بۆ هەتا هەتایش" هەر ئەوەیە کە هەیە[١٦]. وەکو دەرئەنجامێکی ئەمەش هەڵبژاردنەکان دەبێ شەخسی بن. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چەندین گروپی جیاواز جیاواز لە پراکتیکدا لە ئارادان.

## سەرۆک کۆمار و حکوومەت

سـەرۆک کـۆمـار کـە خـاوەنی بەرزترین پۆسـتـە لە ناو دەوڵەتدا لە هەڵبـژاردنێکی ڕاستەوخـۆدا بۆ ماوەی چوار سـاڵ هەڵدەبژێردرێ. سەرۆک کۆمار بۆی هەیە یەک جاری تر خۆی هەڵبژێرێتەوە و دەشبێ یەکێک بێت لەو کەسانەی کە خاوەنی "توانا و لێهاتوویەکی سیاسی و ئایینی" بێت. بێ گومان سەرجەمی کاندیدەکان بەر لە هەڵبژاردنەکان کۆنترۆڵ دەکرێن. بەنووسین ئەوە هەیە کە سەرۆک کۆمار دەبێ موسـڵمـانێکی خـواپەرست بێت. سەرۆک کـۆمـار لە سـوێند خـواردنەکـەیدا پەیمانی ئەوە دەدات کـە پارێزگـاری لە ئایینی فـەرمی وڵاتەکە و یاسـای بنەڕەتی بکات و پەیامی "پەیامبەری ئیسلام و (محەمەد) ئیمامە داوێن پاکەکان" بەجێ بگەیەنێ.

سـەرۆک کـۆمـار یاسـاکـانی ئێـران و پەیماننامـەکـان لەگـەڵ حکوومـەتە بیـانیـیـەکـاندا مـۆر دەکـات، هەروەها بڕوانامـەی کـاری Credit letter دیپلۆماتە ئێرانییەکان دەردەکا و لە دیپلۆماتە بیانییەکانیشی وەردەگرێ، مـیـداليا و شتی تریش دابەش دەکات، لە بەرامـبـەر ئەنجومـەنی وەزیراندا مافی ڤیـتـۆی هەڵپەساردنی هەیە(١٧). بەڵام جگە لەمانە یاسای بنەڕەتی ساڵی ١٩٧٩ سەرۆک کۆماری وەکو وەزیفەیەکی نیوچە بێ بایەخ پشتگوێ خستووە.

کـاری حکوومـەت و وەزیرەکـانیش دەبێ وەکـو هەر وڵاتێکی تر وابێت. حکوومـەت دەتوانێت هەندێ یاسـا دەربکات (ئەو یاسایانەی پێویستـیـان بەڕەزامەندی و پەسەندکردنی پەرلەمان نییە). پەرلەمان دەبێ وەزیرەکـان پەسـەند بکات و وەزیرەکـانیش لە بەرامـبـەر پەرلەمـاندا بەرپرسـیـارن. هەروەها بەپێی هەندێ بڕیارنامە وەزیرەکان دەبێ کۆنترۆڵ بـکرێن نەبادا لە کـارەکـانیـاندا لایەنگری لایەنێک یا کـەسـێک بکەن، هەروەها بەهەمـان شێوە نەبادا ئەوان بەشێوەیەکی گشتی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان یا خێزان

و خزمەکانیان ڕەچاو بکەن.

بەپێی بەشی حەوتەمی یاسای بنەڕەتی دەبێ پرنسیپی شورا (ڕاوێژ) Shura بەهەمان شێوە لە ئوستان و ناوچە جودا جوداکانی تری ئێرانیشدا (لە شێوەی "ئەنجومەنی ڕاوێژکاران" و شورای کار و... هتد) پیادە بکرێ.

## ریفۆرمکردنی یاسای بنەڕەتی

## ١٩٨٩

هاوکات لەگەڵ هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆمار لە ٢٨ی یۆلیۆی ١٩٨٩ کە دوای مردنی خومەینی و هەڵبژاردنی سەرۆکی پێشووی ئێران عەلی خامەنەیی بەڕابەر قەراری گرت، کۆمەڵێ گۆڕانکاری خرایە ناو یاسای بنەڕەتییەوە. لە مادەی ١٠٧دا دەرفەتی "هەڵبژاردنی" ڕابەر لە لایەن جەماوەرەوە لابرا. کاری هەڵبژاردنی ڕابەر (لە ئێستا بەدواوە - و) تەنها لە دەستی مجلس خبرگاندا دەبێ.

بەشێوەیەکی دی دەتوانین بڵێین بەدەزگاییکردنی یا بە(موئەسەساتیکردنی) ویلایەتی فەقیە هەنگاوێکی تریش چووە پێشەوە.

وەکی دی گرنگترین گۆڕانکاری کە هاتە ئاراوە بریتی بوو لەوەی کە پۆستی سەرۆک وەزیران لابرا و سەرۆک کۆماریش کرا بەسەرۆکی حکوومەت. سەرۆک کۆمار بەم شێوەیە دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەی پێ درا. هەروەها وەزیفەی ڕابەریش وەکو جاران زۆر ورد نەدەکرایەوە یا زۆر بەوردی پێناسەی نەدەکرا. ڕابەر ئەم ئەرک و دەسەڵاتانەی هەیە (بڕوانە دەقی ریفۆرمکراوی مادەی ١١٠ لە پەراوێزی ژمارە ١٠ - و).

* ڕابەر زیاتر هێڵە گشتییەکانی سیاسەت دیاری دەکات.

* ڕابەر بەشێوەیەکی فەرمی سەرۆکی فەرماندەی گشتی سوپایە.

* ڕابەر بڕیار لەسەر سازدانی ڕیفراندۆم دەدات.

* لە کاتی ڕوودانی ناکۆکی لە نێوان دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندن و دادوەری یا هەر شتێکی دی لەم بابەتە ئەم وەکو دادوەرێک ئەو ناکۆکییانە یەکلا دەکاتەوە.

* ڕاپەڕاندنی (یا پەسەند نەکردنی - و) بڕیاری دەرکردنی سەرۆک کۆمار (کە دادگای یا پەرلەمان باڵا دەریدەکات) لە دەستی ڕابەر دایە.

* دەسەڵاتی دەرکردنی لێبوردنی هەیە.

* دەسەڵاتی دامەزراندن و دەرکردنی ئەمانەی خوارەوەی هەیە: فوقەهاکانی ناو شورای نگهبان، دادوەری باڵا (عالیترین مقام قوه قضاییه - و)، سەرۆکی گشتی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن (ریس سازمان صدا و سیمای جمهوری اسلامی ایران - و)، فەرماندەی گشتی سوپا، سەرۆکی سوپای پاسداران (فرمانده کل سپاه پاسداران انقلاب اسلامی - و)، هەروەها (فرماندهان عالی نیروهای نظامی و انتظامی - و)، لە کۆتاییشدا (رییس ستاد مشترک - و)، هەر هەموو ئەمانە لە دەستی ڕابەر دایە.

بەپێی مادەیەکی نوێ (١١٢)[١٨] ئۆرگانێکی نوێ بەناوی "مصلحت تشخیص نظام" دروست کرا بۆ ئەوەی ناکۆکییەکانی نێوان شورای نگهبان و ئەنجومەنی یاسادانان (پەرلەمان - و) یەکلا بکاتەوە. ئەندامەکانی ئەم ئۆرگانە تایبەتە لە لایەن ڕابەر/ڕابەرەکانەوە دیاری دەکرێن. بەواتایەکی دی (بەهۆی ئەم ئۆرگانەوە - و) شورای نگهبان مافی ڤیتۆی ڕەهای لە دەست دا.

## سیستمی یاسایی

بەپێی یاسای بنەڕەتی ئایینزای جەعفەری سەر بەئیسلامی شیعی دەبێتە یاسای وڵات و دادگاکان دەبێ پیادەی بکەن. تەنها لەو حاڵەتانەدا نەبێت کە پەیوەندییان بەو مافە تایبەتانەوە هەیە کە هەواداری ئایینزاکانی تری ناو ئیسلام هەیانە و ئەو مافانەش (بەڵام لە سنوورێکی زۆر دیاریکراودا) کە هەواداری هەرسێ کەمینە ئایینییەکانی تر هەیانە کە لە ئێراندا دانیان پێدا نراوە.

ئەو یاسایانەی لە ناو ئەنجومەنی ڕاوێژکاراندا دادەڕێژرێن دەبێ دژ بەیاساکانی جەعفەری نەبن، ئەگەر نا دەبێ هەڵبوەشێنرێنەوە. ئەم مەسەلەیە لە بەشی سێیەم و یازدەیەمی یاسای بنەڕەتیدا بەتەواوی ڕوون کراوەتەوە.

یاساکان خۆیان لە سەرەتاوە هەر هەن (یاساکانی خوا و ئایینزای جەعفەری - و)، تەنانەت ئەگەر پرۆسەی یاسادانانیش لە ناو پەرلەماندا ئەنجامی نەگرتبێت. بۆ نموونە لە مادەی ١٦٧دا[١٩] هاتووە: قازییەکان qadi دەبێ بەپێی یاسا و ڕێساکان (واتە ئەو یاسایانەی پەرلەمان دەریان دەکات) دادوەری بکەن. ئەگەر ئەم جۆرە یاسا و ڕێسایانەش نەبوون ئەوە دەبێ خۆیان یاسای گونجاو لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە ئیسلامییەکان یا فەتواکاندا هەڵبهێنجن و بەپێی ئەوە دادوەری بکەن. دادوەر یا قازی نابێ بڕیار یا حوکمەکەی خۆی دوا بخات تا یاسایەکی گونجاو لەو بوارەدا دەردەچێت. لەبەر ئەمە دەبێ دادوەرەکان شارەزا و بەتوانا بن لە فیقهی ئیسلامیدا و لێهاتوویی ئەوەیان تێدا هەبێ کە لە قورئان و سوننەتەکانی sunna پێغەمبەر و هەر دوازدە ئیمامەکەوە یاسا و ڕێسای پێویست هەڵبهێنجن. بەهەمان شێوە دادوەرەکان نابێ ئەو فەرمان و بڕیارنامانەی حکوومەت پیادە بکەن کە لەگەڵ یاساکانی ئیسلامدا هاودژن. وەکی دی

دەزگایەکی تایبەت هەیە بەناوی (دادگای دادپەروەری ئیداری) کە هەموو کەسێ دەتوانێ لەوێ ئیستیئنافی لابردنی ئەو فەرمان و بڕیارنامانە بکات.

لە مادەی یازدەیەمی یاسای بنەڕەتیدا باس لە پێکهاتەی سیستەمی یاسایی کراوە. بالاترین ئەنجومەنی دادوەری (عالیترین قوە قضاییە – و) کە لە سەرۆکی دادگای بالا، بالاترین مدعی گشتی دەولەت و سێ دادوەری تریش کە لە لایەن ئەنجومەنی یا یەکێتی دادوەرانەوە هەڵدەبژێردرێن، دەکەوێتە سەرووی ئەم هەرەمەوە. دەسەڵاتی دامەزراندن و دەرکردنی دادوەرەکان لە دەست ئەم ئەنجومەنە بالایە دایە. هەروەها ئەم سیستەمە یاساییە دوو دەزگای تری سەرتاسەریش لە خۆ دەگرێ کە دەکرێ ئێمە لێرەدا بەدیوانی چاودێری دارایی ناوزەدی بکەین.

بەشی سێیەمی یاسای بنەڕەتی باس لە "مافەکانی میللەت" دەکات. لەم بەشەدا هەندێ یاسا هەن کە پەیوەندییان بەوەزیفەکانی سیستەمی یاساییەوە هەیە. ئەو یاسایانە پارێزگاری لە ژیان و موڵک و ماڵی هاولاتیان دەکەن؛ هەموو هاولاتییەک مافی ئەوەی هەیە پەنا بۆ دادگاکان ببا و هەروەها پارێزەرێکیش داکۆکی لێ بکا؛ هەموو گومانلێکراوێک دەبێ وەکو بێ تاوان تەماشا بکرێت تا تاوانەکەی دەسەلمێنرێت؛ نابێ ئازار و ئەشکەنجە لەگەڵ یەکێکی گیراودا بەکار بهێنرێت بەمەبەستی ئەوەی زانیاری لێ وەربگیرێ و ناچار بکرێ دان بەشتەکاندا بنێت و... هتد.

## خاڵە ناکۆکەکان

## یاساکانی خێزان و سزادان

یاساکانی ئێران بریتین لە یاساکانی ئایینزای جەعفەری. ئەمەش مانای وایە هەموو یاسا پیادەکراوەکان جا چ ئەوانەی پەیوەندییان بەوەزیفەی دادگاکانەوە، بەهەڵسەنگاندنی بەڵگەکانەوە، بەگەواهیدەرەکانەوە هەیە، یا ئەوانەی پەیوەندییان بەحوکمی دادگاکانەوە هەیە، هەر هەمووی بەشێوەیەکی زۆر ڕوون جیاوازییەکی گەورەیان لەگەڵ نەریتی یاسایی وڵاتە ڕۆژئاواییەکاندا هەیە. بەهەمان شێوە جیاوازی لەگەڵ ئەو تەفسیرە مۆدێرنەشدا هەیە کە لە بەشەکانی تری جیهانی ئیسلامیدا هاتنە کایەوە. بوارە ناکۆکەکان یا جیدال ئامێزەکان لێرەدا بەزۆری پەیوەندییان بەیاساکانی خێزان و یاساکانی سزاوە هەیە. لە یاسای بنەڕەتیدا ئەوە بەڕوونی ساغ کراوەتەوە کە "یاساکانی ئیسلام" وەکو یاسایەکی خێزان پیادە دەکرێ. بەهەمان شێوەی یاساکانی "سزای ئیسلام"یش دەبێ پیادە بکرێ.

یەکێک لەو دیاردانەی کە دێباتەکانی زیاتر دەوروژان بریتی بوو لە پیادەکردنی دوو یاسای جیاواز بۆ پیاوان و ژنان. بۆ نموونە لەو بوارانەی پەیوەندیان بەیاساکانی خێزان و میراتەوە هەبوو، گەواهیدان لە بەردەم دادگاکاندا، بڕیارنامەکانی هاوپەیوەند بەکار و جلوبەرگەوە هەبوو... هتد.

فرە ژنی، یا ئەوەی کە پیاو بۆی هەیە تا چوار ژنی هەبێ، لە پراکتیکدا ڕۆڵێکی بچووکی هەیە. ئەوەی کە لێرەدا ڕۆڵێکی زۆر گەورەی هەیە بریتییە لەو نەریتە شیعییەی پێی دەڵێن ژنهێنانی موتعە یا سیغە sighe، واتە ئەو پەیوەندییە سێکسییە شەرعییەی کە تەنها بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەردەوام دەبێ. مافی جیابوونەوە چەندین جۆری هەیە. لەم

بوارەدا پیاو مافێکی ڕەهای هەیە، بەڵام ژن مافێکی تەسک و سنوور بەزێنراوی هەیە. پیاو بەتەنها خۆی خێزان بەڕێوە دەبا و بەخێوی دەکا، بەڵام ژن هەموو ماڵ و موڵکەکانی و داهاتی کارەکەشی (ئەگەر کار بکات) بەتەواوی تەنها بۆ خۆیەتی، واتە وەکو پیاو ئەرکی بەخێوکردنی خێزانی لەسەر شان نییە.

هەندێ نەریت و ڕێسا هەن کە بوونەتە هۆی ئەوەی پیاوان و ژنان ئەرک و مافی جیاوازیان هەبێ، بۆ نموونە: پیاوە (زاوا) کە دەبێ "دیاری بەیانان"[٢٠] بداتە ژنەکەی (بووک) پاش ئەوەی شەوی یەکەم لە لای بوو، هەروەها پیاوە کە ئیمامی خێزانە و مافێکی تەواوی هەیە کە بڕیار لەسەر خێزانەکەی بدا. بەهەمان شێوەش ئەو یاسا و ڕێسا ئاڵۆزانەی پەیوەندییان بەمیراتەوە هەیە وا دەکات کە بەشێوەیەکی گشتی ژن نیوەی پیاوی بەربکەوێت. لە پرسی گەواهیدان لە بەردەم دادگاشدا گەواهی دوو ژن بەرامبەر بەگەواهی یەک پیاو دەژمێردرێ. بەهەمان شێوە جزیەدانی پیاویش نیوەی ژنە.

لە ڕێساکانی یاسا نەریتییەکانی خێزان لە ناو ئیسلامدا ئەوە ڕەنگی داوەتەوە کە خێزان (نەک تاکە کەس) بنەمای ستروکتوری کۆمەڵگایە (بڕوانە مادەی ١٠،١١ لە یاسای بنەڕەتی ئێران)[٢١]. مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەرکەکان و مافەکانی (ژن و پیاو - و) "یەکتر هاوسەنگ" دەکەنەوە ئەگەر بێتو مرۆڤ خێزان و خزم و کەسوکار وەکو (یەک یەکەی) تەواوکەری یەکتر تەماشا بکات.

مناڵ هی باوکە یا دەگەڕێتەوە بۆ خێزانی باوک. ئەمەش بەو مانایە دێتەوە کە پیاو بۆی هەیە ژنێک لە ئایینێکی (دان پێ دانراوی) دیکە بخوازێت. منال سەر بەئایینی باوک دەبێ. بەڵام لە هەمان کاتدا ژنێکی موسڵمان بۆی نییە شوو بەیەکێکی غەیرە موسڵمان بکات.

گرفتێکی زۆر جەدەلئامێزی دیکە یاساکانی "سزای ئیسلامیە". لە نەریتە یاساییەکانی ترادیسیۆنی ئیسلامیدا دادوەرەکان ڕۆڵێکی

یەکلاکەرەوەیان لەو گرفتە سەختانەدا هەیە کە دەبنە مایەی ناکۆکی و مشتومڕ لە نێوان دوو کەس یا دوو لایەندا. لەم حاڵەتانەشدا ئەڵبەتە دەبێ دوو لایەن هەبێ؛ سکاڵانووس و سکاڵا لێ کراو یا بەعەرەبی گوتەنی مدعی و مدعی علیه. لە هەندێ حاڵەتدا، بۆ نموونە لە تاوانەکانی (حد hadd، کۆ: حدود)دا خوا خۆی خاوەنی مەسەلەکەیە. ئەو حاڵەتانەش ئەوانەن کە سزاکەیان لە قورئاندا یا لە نەریتێکی زۆر پیادەکراودا نووسراوە. ئەو حاڵەتانەش بریتین بۆ نموونە لە دزی (گەورە) کە دەبێ دەستی ڕاستی دزەکە ببڕنەوە، هەروەها ڕێگری و چەتەگەری کە سزاکەی مەرگ و هەڵواسین و بڕینی ئەندامەکانی لەشە، هەروەها زیناکردن کە سزاکەی جەڵدە لێدانە یا لە حاڵەتە گەورەکاندا سزاکەی دەبێتە شێوەیەک لە شێوەکانی سزای مەرگ (لە هەندێ حاڵەتدا لە ڕێگەی ڕەجم کردنەوە). هەر کەسێ یەکێک بەدرۆ یا بەبێ بەڵگە لە بواری ژنخوازیدا تاوانبار بکات سزاکەی دەگاتە جەڵدە لێدان. سزای مەی خواردنەوە (یا بەکارهێنانی شتی وەکو مەی و مادە سڕکەرەکان) جەڵدە لێدانە. هەروەها "بلاوکردنەوەی فەساد لەسەر زەویدا" سزای مەرگی هەیە (بڕوانە سورەتی المائدە، ئایەتی 37/33)[٢٢]. زۆر جاریش لە بواری سزای مەرگ بەرامبەر بەوانەی ئێمە پێی دەڵێین بەرهەڵستکاری سیاسی، لە ئێراندا ئاماژە بەقورئان دەکرێ. بەهەمان شێوە لە بواری بەکارهێنان و مامەڵەکردنی مادە سڕکەرەکاندا سزای مەرگ پیادە دەکرێ. هەروەها سزای "ارتداد"یش مەرگە، واتە ئەو کەسانەی لە ئایینی ئیسلام وەردەگەڕێنەوە و باوەڕ بەئایینێکی تر دەهێنن یا خۆیان بەبێ ئایین دادەنێن بەمەرگ سزا دەدرێن.

دەبێ ئەوەش یاداشت بکەین کە مردن، کوشتنی بێ ئەنقەست یا بێ مەبەست، هەروەها ئازاردانی لەشولار ناچنە خانەی تاوانەکانی (حد)ەوە، بەڵکو وەکو گرفتێکی یاسای مەدەنی تەماشا دەکرێن. لێرەدا ئەو کەسەی ئازارەکەی پێ گەیشتووە بەخاوەنی مەسەلەکە دەژمێردرێ، لە حاڵەتێکیشدا ئەو کەسە بمرێ ئەوە کەسوکار و خزمی ئەو (خاوەنی

خوێنەکە) بەخاوەنی مەسەلەکە دەژمێردرێن.

جارێکی تریش لێرەدا ئەوە دەبینین کە خێزان و کەسوکار بنەمای ستروکتوری کۆمەڵگان لە ئێران. لایەنی سکالانووس (مدعی) لەم حاڵەتانەدا "ماف"ی Iex talionis (قصاص) هەیە. ئەگەر خاوەنی/خاوەنەکانی مەسەلەکە هەندێ مەرجی دیاریکراویان تێدا بێت ئەوە دەتوانن بەپێی پرنسیپی "چاو بەچاو و دان بەدان" و ئازار بەئازار، داوای سزادانی (قصاص)ی تاوانبارەکە بکەن. بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەتوانن لەو مافەی خۆیان خۆش بن و تەنها بەقەرەبووکردنەوە مادییەکە یا جزیەکە ڕازی بن یا بەشێوەیەکی گشتی واز لە هەموو شتێ بێنن یا لە هەموو شتێ خۆش بن.

بەپێی یاساکانی ئەو ئایینزانەی لە ئێراندا کاری پێ دەکرێ جزیەی پیاو بۆ ژن نیوەی جزیەی ژنە بۆ پیاو. بڕی ئەو پارەیەی (جزیە) لە بری کوشتنی کەسێکی ناموسڵمانی سەر بەئایینێکی دان پێ دانراوی دیکەدا دەدرێ بریتییە لە ١/١٠، بەڵام جزیەی کوشتنی ژنێکی ناموسڵمان بریتییە لە ١/٢٠. لە هەمان کاتدا جزیەی پیاو لە کاتی کوشتنی یەکێکی ناموسڵمانی بێ ئاییندا یا سەر بەئایینێکی نامۆڵەتدراودا هیچ نییە.

پیادەکردنی جەڵدە لێدان و بڕینی ئەندامەکانی لەش وەکو شێوەیەکی سزادان بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ مادەی ٣٨ی یاسای بنەڕەتیدا[٢٣] کە خوازیاری قەدەغەکردنی ئازار و ئەشکەنجەیە ناکۆک نییە، چونکە مەسەلەکە لێرەدا مەسەلەی سزایە نەک مەسەلەی بەکارهێنانی ئازار و ئەشکەنجە بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاری و دان پێ دانان وەکو لەو مادەیەی سەرەوەدا هاتووە.

ڕوونکردنەوەیەکی تایبەت لە بارەی یاساکانی سزا و (قصاص)ەوە لە دوای دەرچوونی یاسای بنەڕەتییەوە بلاو کرایەوە. بەهەمان شێوەش چاودێریکردنی ماسمێدیاکان بەپێی یاسایەک لە ساڵی ١٩٨٦دا دووبارە ڕێکخرایەوە.

## سیستمی سیاسی له واقیعی ئێراندا

## ۱۹۷۹ - ۲۰۰۱

### پرسی ڕابەر لە دوای مردنی خومەینییەوە

ئەگەرچی خومەینی ئێستا نەماوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاوەکو ئەمڕۆ وەک سیمبۆلێکی شۆڕشی ئێران (کە دژ بەدەسەڵاتی تاکڕەوانەی شا بەرپا کرا) تەماشا دەکرێ. نەمانی خومەینی لە ژیاندا بەنیسبەت دەسەڵاتی ڕاپەڕاندنەوە زۆر باشتر بوو وەک لە مانی ئەو: چون ئەو کاتە مرۆڤ دەتوانێ ئاماژەی پێ بکات، پشت بە وتە و هەڵسەنگاندنەکانی ئەو ببەستێت، بەبێ ئەوەی مەترسی ئەوە لە ئارادا هەبێ کە خۆی ڕاستەوخۆ نارەزایی بەرامبەر بەو تەفسیر و پیادەکردنە دەربڕی کە ئێمە بۆ قسە و نووسینەکانی ئەو دەیکەین.

وەزیفەی دووەمی خومەینی بریتی بوو لە بەدەزگایی کردنی "ڕابەر" لە چوارچێوەیەکی دەستووریدا. بەشێوەیەکی تر دەتوانین بڵێین دەزگای یا ڕێکخراوی ویلایەتی فەقیە لەسەر بنەمای نەریتێکی تا ڕادەیەک کۆنی ناو ئیسلامی شیعی بنیاد نراوە. مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ/سەر بەخانەوادە یا گروپێکە کە ئەویش لە ڕێگەی خۆیەوە دەگەڕێتەوە بۆ/سەر بەڕاوێژکارێکی ڕوحییە کە پێی دەڵێن مەرجەع (لە زمانی ئینگلیزیدا زۆر جار پێی دەڵێن "source of emulation"). بەزۆریش پیاو یەکێکی نورانی هەڵدەبژێرێت کە "نیشانەی خوا"ی پێوە دیار بێت (ئایەت و الله - ئایەتوڵڵا). وەک نەریت یەکێک لە ئایەتوڵڵا مەزنەکان وەک کاندید دەردەکەوێ و ئیدی ئەوانی دیکەش وەک مەرجەعی خۆیان دانی پێدا دەنێن.

خومەینی بووە ڕابەرێکی ڕوحی لەم بابەتە کە بەبێ کۆنکرانس لە لایەن

هەمـووانەوە قـبـوڵ کـرا. لە ڕێگەی پلە و پایەی خـۆیەوە لە ناو دەوڵـەتدا (بەپێی مـادەی پێنجـەمی یاسـای بنەڕەتی) خـومـەینی بەپێی نەریتی تیـۆلۆجی شیـعی لە پراکـتیـکدا ئەو وەزیفـەی هەبوو کە دەبووایە ئیـمـامی مـەهدی هەیبـووایە. لێرەدا "شـیـعـە ڕاسـتڕەوەکـان" و تیـۆلۆجـیسـتـە هەرە سـوننەتیـەکـان ڕەخنەکـانی خـۆیان ئاشکرا کـرد. خـومـەینی دەسـتی بەسـەر دەسەڵاتێکی زیاد لە پێویستدا گرتبوو. هاوکات لەگەڵ مردنی خومەینیدا لە ٣ی یۆنیـۆی ١٩٨٩ ناکۆکییـەکان زیاتر گریان گرت. مجلس خبرگان عـەلی خـامـەنەیی بەرابەر هەڵبژارد. ئەم هەڵبژاردنە ڕۆژێک دوای مـردنی خومەینی ئاشکرا کرا. بەڵام ١٠ ڕۆژ دواتر، واتە لە ١٤ی یۆنیۆ مەرجەعـە گـەورەکـانی تر کـاندیدی خـۆیان ئاشکرا کـرد. شـەش ئایەتوڵڵای گـەورە ئەوەیان ئاشکرا کرد کە ئەوان ئایەتوڵڵا محەمەد عەلی ئەراکی بەمەرجەعی خۆیان دەزانن و دان بەودا دەنێن. ئەم کارە دەبێ وەکو ڕەخنەیەک لە یاسای بنەڕەتی تەمـاشـا بکرێ. لەم کـاتەدا دژە هەڵوێسـتـێکی لە بەرامبـەر ئەم هەڵوێسـتـەی ئەماندا زۆر پێویست بوو. ڕۆژی ٦ی ئاگوست "زیاتر لە ٨٠ نماینده‌ی ئایینی ئیـسـلام" لە ڕاگەیاندنێکدا پشـتـیـوانی خـۆیان لە عـەلی خـامـەنەیی، وەک ڕابەرێکی ڕوحی لەبری خـومـەینی، ڕاگـەیاند. تەنانەت دوای مـردنی ئایەتوڵڵا ئەراکـیش (لە تەمـەنی زیاتر لە ١٠٠ سـاڵ) لە نۆڤەمبەری ١٩٩٤دا، هێشتا عەلی خامەنەیی هەر وەکو مەرجەع حیسابی بۆ نەدەکرا.

کاندیدبوونی خامەنەیی (بۆ مەرجەعیـەت - و) لە لایەن هەندێ گروپەوە بەتـوندی پشـتـیـوانی لێ دەکـرا، بەڵام ئەو خـۆی وای بەچاک زانی خـۆی بکشـێنێـتـە دواوە و هۆکارەکـەشی بۆ کـەمی کـات گـەڕانەوە. پلە و پایە و ئیـعـتـیـبـاری ئایینی خـامـەنەیی و هاوسـەنگی ئەو لە نێـو ئایەتوڵڵا گەورەکاندا، لەگەڵ خومەینیدا بەراورد نەدەکرا. خامەنەیی بیریارێکی گەنج بوو و تێڕوانینێکی تری لە مەسەلەی تێگەیشتن و پیادەکردنی شەریعەی ئیسـلامیدا هەبوو. ئەم خاڵانە بووە هۆی ئەوەی سەرنجی کەسانی دیکە لەم

بوارەدا ڕابکێشێ کە ناودارترینیان عەبدولکەریم سروش بوو. داواکردنی ریفۆرمی سیاسی و بەرفراوانکردنی ماف و ئازادییەکان بەشێک بوون لەو داواکارییانەی کە خوێندکارەکان لە خۆپیشاندانەکانی خۆیاندا هەر لە ساڵی ۲۰۰۱ بەدواوە پێیان لەسەر دادەگرت.

لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەماندا (مەجلیسی شورای ئیسلامی) جەماوەر تاکە کەسەکان هەڵدەبژێرن نەک حیزبەکان. بەلایەنی کەمەوە لە ماوەی

١٩٨٠ - ١٩٨٧ پەرلەمان لە دەستی یەک تاقە حیزبدا بوو ئەویش حیزبی جمهوری ئیسلامی IRP بوو. ئەم حیزبە لە ساڵی ١٩٧٩دا دامەزرا و پاش چەند ساڵێک دەستی بەسەر دەزگا هەرە گرینگەکانی دەوڵەتدا گرت: حکوومەت، پەرلەمان، مجلس خبرگان، دەزگا شۆڕشگێڕییە تازەکان (دادگای شۆڕش، کۆمیتەکانی شۆڕش، پاسداران). پاش داگیرکردنی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران، حیزبی جمهوری ئیسلامی زیرەکانە توانی لە نۆڤەمبەری ١٩٧٩دا یەکەمین سەرۆک وەزیرانی "ئیسلامی - لیبراڵ" کە بازرگان بوو لەسەر کار لاببا. بەهەمان شێوە زۆر بەزرنگی توانی لە یۆنیۆی ١٩٨١دا یەکەمین سەرۆک کۆماری "ئیسلامی - لیبراڵ" کە بەنی سەدر بوو لە کار بخا. دواتر بەنی سەدر توانی هەڵبێ و خۆی بگەیەنێتە گروپێکی بەرهەڵستکار لە پاریس.

بەڵام مەهدی بازرگان لە ناو ئێراندا مایەوە و لە هەشتاکاندا سەرکردایەتی تاقە حیزبێکی بەرهەڵستکاری (نهضت آزادی) دەکرد کە مۆڵەتی کارکردنی هەبوو. بازرگان ڕەخنەی لە تاکڕەوی و سیاسی ئابووری کارەسات ئامێزی کۆماری ئیسلامی ئێران گرت و لە قۆناغەکانی سەرەتای شەڕی عێراق و ئێراندا داوای ڕاگرتنی ئەو شەڕەی کرد. حیزبەکەی بازرگان لە پەرلەمان دەرکرا و ئەندامەکانیان تووشی ڕاونان و گرتن هاتن، بەڵام خودی حیزبەکە لە ساڵی ٢٠٠١دا قەدەغە کرا. پاش مردنی بازرگان لە ساڵی ١٩٩٥دا سەرکردایەتی حیزبەکە درایە دەست یەزدی، کە لە ساڵی ١٩٧٩دا وەزیری دەرەوەی ئێران بوو. دادگایەکی شۆڕش لە تاران لە ساڵی ٢٠٠١دا حیزبی (نهضت آزادی) بەپیلانگێڕی لە دژی ڕژێمی ئیسلامی ئێران تاوانبار کرد و دواتر قەدەغەی کرد. زۆربەی ڕابەرانی ئەم حیزبە دواتر خرانە کونجی زیندانەکانەوە.

بەهێزترین حیزب کە هەڕەشەی لە حیزبی جمهوری ئیسلامی دەکرد بریتی بوو لە موجاهیدینی خەڵق (لە جیهادەوە وەرگیراوە) کە ڕێکخراوێکی "ئیسلامی - مارکسی" بوو. مجاهدین خلق لەو سەردەمەدا زۆر ترسناک

بوون چونکه ڕووی دەمیان لە هەمان ئەو گروپانە بوو (کرێکار، جووتیار، بۆرژوای بچووک) کە حیزبی جمهوری ئیسلامی دەیویست کاریان لەگەڵدا بکات. ڕابەری مجاهدین خلق (مەسعود رەجەوی) لە ساڵی ١٩٨١دا هەڵهات و دەوڵەت توانی لە نێوان ١٩٨١ - ١٩٨٢دا موجاهدین بەشێوەیەکی وەحشیانە لەناو ببا. هەزارەها کەس لە هەوادارەکانیان (بەقسەی خۆیان دەیەها هەزار کەس) لە سێدارە دران. سەرکردایەتی حیزب[٢٤] ئێستا لە ناو عێراقە و سوپایەکیشی هەیە کە هەر لەوێوە هەندێ جار هێرش دەکاتە سەر ئێران.

پارتی کۆمەنیستی ئێران ناسراو بەتودە کە پشتیوانی لە ڕژێمی خومەینی دەکرد تا وەکو ساڵی ١٩٨٣ مۆڵەتی کارکردنی درا. لەم ساڵەدا سەرانی تودە گیران و ساڵی ١٩٨٨یش هەندێکیان لە سێدارە دران.

ئۆپۆزیسیۆن لە ناو کۆماری ئیسلامی ئێراندا تەنها لە چوارچێوە ئیسلامییەکەیدا مۆڵەتی پێ دەدرێ. بەپێی بڕیارێک کە لە ساڵی ١٩٨٨دا دەرچوو، وەزارەتی ناوخۆ پاش لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت ئەوجا مۆڵەتی کارکردن بەحیزبە سیاسییەکان دەدا. بەڵام هەتاوەکو ئێستاش چ ئۆپۆزیسۆنە چەپڕەوەکان و چ ڕاستڕەوەکانیش (هەوادارى پادشایی) لەناوبراون و زۆر جاریش ئەم لەناوبردنە بەشێوەیەکی فیزیکی بووە.

حیزبی جمهوری ئیسلامی لە دەرەوەڕا وەکو بەرەیەکی یەکگرتوو خۆی دەردەخست. بەڵام هەر زۆر زوو حیزب دووبەرەکییەکی زۆری تێ کەوت، هیچ نەبێ لە مەسەلە ئابوورییەکاندا. یەکێک لە فراکسیۆنەکان پشتیوانی موڵکایەتی تایبەتی دەکرد و هەواداری کرانەوەیەکی ئابووری بوو لەگەڵ ڕۆژئاوادا. فراکسیۆنێکی ڕادیکاڵ imamiya "خەتی ئیمام" داوای ئەوەیان دەکرد کە دەوڵەت بەشێوەیەکی سەنترال ئابووری وڵاتەکە بەڕێوە ببات. لە ڕێگەی ریفۆرمێکی ڕادیکاڵانەی زەویوزار و دانانی یاسایەکی پرۆگرەسیڤانە (پۆزەتیڤانە) بۆ بازاڕی کار، دەکرێ بارودۆخی هەژارەکانی

(موستەزعەفین) ئێران باشتر بکرێتەوە. بازرگانی دەرەکی دەبێ بکرێتە دەوڵەتی و پەیوەندییە ئابوورییەکانیش دەبێ لەگەڵ وڵاتە سۆسیالیستەکاندا گرێ بدرێ.

ئەم باڵەی نێو حیزب لە ساڵی ١٩٨٧دا ئەوەندە بەرجەستە ببوو، لەوانەشە خەتەرناک، تا وای لێهات حیزب زۆر بەئاسانی لەبەر یەک هەڵوەشایەوە. هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، ناکۆکییەکانی نێو حیزبی جمهوری ئیسلامی کارێکی وای کرد کە نەتوانرێت هیچ جۆرە بڕیارێک لە بارەی گرفتە ئابوورییە سەرتاسەرییەکانی ئێرانەوە بدرێت.

بەڵام ئەو دووبەرەکییە قووڵەی نێوان هەردوو باڵەکەی ڕژێم بەهیچ شێوەیەک لە دوای ساڵی ١٩٨٧وە ئارام نەبووەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەنانەت لە دوای مردنی خومەینیشەوە بووە مانیفێستێک. لە قۆناغی نەوەدەکانیشدا هەردوو باڵەکەی ناو ڕژێم زیاتر خۆیان ئۆرگانیزە کرد و کار گەیشتە ئەوەی هەردوو لا لە ناو تاراندا دوو مەڵبەندی هەڵبژاردنی جودایان هەبوو.

هەڵبژاردنەکانی خولی شەشەمی مەجلیس (پەرلەمان) لە فابریوەری و مارسی ٢٠٠٠دا بەڕێوەچوون. ئێران سیستمی هەڵبژاردنی فەرەنسی پیادە دەکات، واتە زۆرینەی دەنگەکان لە دوو خولی جیاوازدا. بەواتایەکی دی لە خولی یەکەمدا تەنها ئەو کاندیدانە بەبراوە دەژمێردرێن و بۆیان هەیە بەشداری خولی دووەم بکەن کە زۆرینەیەکی دەنگەکانیان بەدەست هێنابێ بەمەرجێ ئەو زۆرینەیە لە چواریەکی دەنگەکان (لەو ناوچەیەی هەڵبژاردنەکەی تێدا ساز کراوە - و) کەمتر نەبێ. لە خولی دووەمیشدا دوو سەرکەوتووترین کاندیدی خولی یەکەم لەگەڵ یەکتردا پێشبڕکێ دەکەن. لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٠دا ٢٢٥ کاندید (لە کۆی ٢٩٠) لە خولی یەکەمدا هەڵبژێردران.

ئەوانەی لە ساڵی ٢٠٠٠دا پشتیوانیان لە ریفۆرمەکانی سەرۆک

خاتەمی دەکرد "ریفۆرمیستەکان" بوون کە بانگەشەیان بۆ ریفۆرمی ئابووری، پلورالیزم، بەرابەری لە بەردەم یاسا و فراوانترکردنەوەی ئازادییە شەخسییەکان دەکرد. زۆر جار پۆرترێتی ریفۆرمیستەکان بریتی بوو لە پیاوێک کە سووکە زەردەخەنەیەکی بەسەر لێوەوە بوو و سووکە ریشێکیشی هەبوو. کاندیدە "کۆنسێرڤاتیڤەکان"یش پێیان لەسەر بایەخە پیرۆزەکانی شۆڕش و بەها ڕوحییەکان دادەگرت. ئەمان زەردەخەنەیان نەدەخستە سەر لێوەکانیان چونکە ئایەتوڵڵا خومەینی ئەوەی ڕوون کردبووەوە ئەوەی زەردەخەنە بکات بۆ شەیتانی دەکات.

خودی ریفۆرمیستەکان بەسەر چەندین فراکسیۆندا دابەش ببوون. گرنگترین حیزبی ئەوان (حزب مشارکت اسلامی) بوو (IIPP) کە لە لایەن محەمەد ڕەزا خاتەمی برای سەرۆک کۆمارەوە ڕابەری دەکرا. لە کاتی هەڵبژاردنەکەدا ١٨ فراکسیۆنی "ریفۆرمخوازی" جودا جودا خۆیان لە "بەرەی دووی خورداد"دا کۆکردەوە (واتە بەرەی ٢٣ی مای، چونکە لە ٢٣ی مای ١٩٩٧ خاتەمی هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری بردەوە). کاندیدە "هەرە کۆنسێرڤاتیڤەکان" خۆیان لە "کوالیسیۆنی هەوادارەکانی خەتی ئیمام و ڕابەر"دا کۆکردەوە. ریفۆرمیستەکان سەرکەوتنێکی گەورەیان لە هەڵبژاردنەکاندا بەدەست هێنا. پاش خولی دووەمی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٠ نزیکەی ٢٠٠ ئەندامی مەجلیس "بەریفۆرمخواز" لە قەڵەم دران و ئەو ٩٠ ئەندامەی تریش بە"کۆنسێرڤاتیف" لە قەڵەم دران. بەڵام سنووری نێوان ئەو دوو گروپە زۆر ڕوون نەبوو، چونکە زۆرێک لەو کاندیدانە بەشێوەیەکی فەرمی وەک "بێ لایەن" هەڵبژێردرا بوون.

ریفۆرمیستەکان لە ناو خودی تاراندا توانیان ٢٦ (لە کۆی ٣٠) مەندات ببەنەوە. لەم ناوچەیەدا سەرۆک کۆماری پێشوو، هاشمی ڕەفسنجانی، دابەزێنرایە پلەی (٣٠) لە لیستی کاندیدەکاندا، بەڵام پاش ئەوەی شورای نگهبان هەندێ لە کاندیدەکانی پەسەند نەکرد ڕەفسنجانی

بەرز کرایەوە بۆ کاندیدی پلە Z . هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ۲۰۰۰یش وەکو هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۹۷ پرۆتێستێکی ئاشکرا بوو دژ بەو پێکهاتەیەی ئێرانی بەڕێوە دەبرد. لە لایەکی ترەوە "ریفۆرمیستە" سەرکەوتووەکان لە ناو خودی خۆیاندا بەسەر چەندین فراکسیۆندا دابەش ببوون کە هەریەکە و لە ئاستی مەسەلە ئابووری و کۆمەلایەتییەکاندا خاوەنی بیروبۆچوونێکی جودا بوو. چاوەڕوانی ئەوەش لە نماینده "بێ لایەنەکان" نەدەکرا کە بەپێی مەسەلە ئیدیۆلۆژیەکان گرفتەکان هەڵبسەنگێنن و (لە پەرلەماندا - و) دەنگیان لەسەر بدەن، بەڵکو ئەوان بەپێی بەرژەوەندییە مەسڵەحەت ئامێزەکانی ئەو ڕۆژانە بڕیارەکانی خۆیان دەدا.

بەلام ئێران ئەوڕۆکە بۆتە خاوەنی سیستمێکی سیاسی ئەوتۆ کە تیایدا تەواوی ئەو فراکسیۆنە نافەرمیانەی تاوەکو ئێستا بوونیان لە ناو ڕژێمەکەدا هەبووە بەحیزبی دیفاکتۆ دادەنرێن. بەپێی ئامارە فەرمیەکان ڕێژەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۲۰۰۰دا گەیشتە نزیکەی ٪٦۹ . هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ساڵی ۲۰۰۰ لە زۆر ڕووەوە مانای "ئاسایی کردنەوەی" ئەو ژیانە سیاسییە شۆڕشگێرییەی دەگەیاند کە پێشتر لە ئێراندا هەبوو. بەلام لە هەمان کاتدا شورای نگهبان ٥٧٦ کاندیدی لە کۆی ئەو ٦٨٦٠ کاندیدە پڕ هیوایە ڕەت کردەوە کە خۆیان بۆ هەڵبژاردنەکانی مجلس شورای اسلامی کاندید کردبوو. لە نێو ئەو کاندیدانەدا ٥٠٤ دانەیان ژن بوون و ۳٥ دانەشیان غەیرە موسڵمان بوون.

## سەرۆک کۆمار

دەسەڵاتەکانی سەرۆک کۆمار لە کاتی فەرمانڕەوایی خومەینیدا زۆر لاواز بوون. هەردوو سەرۆک کۆماری پێشوو بەنی سەدر (١٩٨٠ - ١٩٨١) و خامەنەیی (١٩٨٨ - ١٩٨٩) ڕۆڵێکی هەنۆکەییان هەبوو. کاتێ کە مەرگ خومەینی بەساڵاچووی پێچایەوە شەڕێکی سەخت لەسەر دەسەڵات و لێهاتوویی سیاسی لە نێوان ڕەفسنجانی و مونتەزەریدا دەستی پێ کرد. مونتەزەری یەکێک بوو لە ئایەتوڵڵا مەزنە (ayatullah uzma) هەرە ناودارەکانی شاری قوم کە لە ساڵی ١٩٨٥دا لە لایەن شورای پسپۆڕەکانەوە، واتە مجلس خبرگانەوە بەشێوەیەکی فەرمی وەک جێگری خومەینی هەڵبژێردرا. کاتێ کە مونتەزەری کرا بەجێگری خومەینی وا چاوەڕوان دەکرا نمایندەگی خەتێکی "هەرە کۆنسێرڤاتیڤ" بکا، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٨ - ١٩٨٩دا ناوی مونتەزەری بەمەرجی لیبرالیزەکردنی بارودۆخی سیاسی و ئابووری ئێرانەوە گرێدرا.

لە ساڵی ١٩٨٦دا مەسەلەی ئێران کۆنترا ئاشکرا بوو، کە تیایدا ئاماژە بۆ ڕەفسنجانی دەکرا وەک نمایندەی ئێران کە لەگەڵ شەیتانی گەورە، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا خەریکی گفتوگۆکردن بوو. لە مانگی ئۆکتۆبەری ١٩٨٦دا مەهدی هاشمی دەستگیر کرا، چونکە مەسەلەی چەک فرۆشتنەکەی بەئێران بۆ گۆڤارێکی لوبنانی ئاشکرا کرد. دواتر مەهدی هاشمی لە مانگی سێپتامبەری ١٩٨٧دا بەتاوانی "بڵاوکردنەوەی فەساد لەسەر زەوی" درایە بەر گوللە (بڕوانە پێشتر کە باسمان لەم مەسەلەیە کرد و بەئایەتێکی قورئانەوە گرێمان دا). هادی کە برای مەهدی هاشمی بوو، زاوای مونتەزەری بوو. لەم شەڕ و کێشەیەی نێوان مونتەزەری - ڕەفسنجانی، ئەمەی دواییان خەریک بوو دەسەڵات بگرێتە دەست و لە مارسی ١٩٨٩شدا مونتەزەری دەستی لە کار کێشایەوە.

له ساڵی ١٩٨٨دا ڕێگەکان بۆ ڕەفسنجانی زیاتر تەخت بوون. له یۆلیۆی هەمان ساڵدا، له کاتێکدا که بارودۆخه سەربازییەکه له بەرژەوەندی ئێراندا نەبوو، خومەینی ناچار بوو ئاگربەستی نێوان عێراق و ئێران قبوڵ بکات. دواتر خومەینی ڕەفسنجانی بەفەرماندەی کارای گشتی سوپا دەسنیشان کرد. ڕەفسنجانی (که جاران کۆنترۆڵکردنی هێزی "پاسداران" له ژێر دەستی هاوپەیمانەکانی خۆیدا بوو) ئێستا له ڕێگەی ئەم پۆسته تازەیەوە دەیتوانی هەموو هێزه چەکدارەکانی تریش بخاته ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

خامەنەیی سەرۆک کۆمار کەمەنداتەکەی (ماوەی کار) له پاش مردنی خومەینی له یۆنیۆی ١٩٨٩دا، له تەواوبووندا بوو، کرایه جێگری خومەینی (ڕابەر) و وەلی ئیمامی مەهدی. بەم شێوەیه خامەنەیی بەشێوەیەکی فەرمی بووه بەرزترین دەسەڵاتداری ئێران. لەمەش گرینگتر عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسنجانی له مانگی حەوتدا بەسەرۆک کۆمار هەڵبژێردرا و هاوکات لەگەڵ ئەم هەڵبژاردنەدا یاسای بنەڕەتی ئێرانیش گۆڕا و پۆستی سەرۆک وەزیران لابرا و سەرۆک کۆمار بووه سەرۆکی حکوومەت. بەم کاره پۆستی سەرۆک کۆمار گرینگییەکی زۆر جیاوازتری له جاران پەیدا کرد. جووڵانەوه و دەرکەوتنەکانی ڕەفسنجانی ئەوەیان دەردەخست که ئەو زیاتر له خودی خامەنەیی بەفیعلی له ڕابەر دەچوو.

له هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماردا ڕەفسنجانی توانی ٩٤,٥٪ دەنگه بەشداربووەکان بێنێتەوه و ببێ بەسەرۆک کۆماری ئێران. تاقه دژه کاندیدێک که لەو هەڵبژاردنانەدا لەگەڵ ڕەفسنجانیدا پێشبڕکێی دەکرد وەزیری پێشووی کشتوکاڵ بوو (شەیبانی) که وەک نمایندەیەکی "لیبراڵی بێ لایەن" خۆی کاندید کردبوو. شەیبانی وەک کاندیدێکی یەکجار لاواز توانی تەنها ٣,٨٪ دەنگەکان بێنێتەوه. پاش ئەوەی شورای نگهبان ناوی زیاتر له ٨٠ کاندیدی تری ڕەت کردەوه، هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆمار زیاتر له ڕاگیرییەک دەچوون، لەسەر ئەو بڕیاره سیاسییانەی له دوای

مردنی خومەینییەوە لە ئارادا بوون، تا لە هەڵبژاردنێکی ڕاستەقینە. ڕێژەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکاندا گەیشتە ٦٨,٥٪. هاوکات بەزۆرینەی ٩٧,٣٪ بڕیار لەسەر کۆمەڵێ گۆڕانکاری لە یاسای بنەڕەتیدا درا. بەهۆی یەکێک لە گرنگترین ئەو گۆڕانکاریانە کە بریتی بوو لە لابردنی پۆستی سەرۆک وەزیران، یەکێک لە سەرسەختترین دوژمنەکان (موسەوی) کە نمایندەی خەتێکی ئابووری ڕادیکاڵی دەکرد، لەو گۆڕەپانەدا نەما. لە بری ئەوە ئەوانەی لە کابینە تازەکەدا کاریان دەکرد بریتی بوون لەو تەکنۆکراتانەی کە بەزۆری خوێندنیان لە ڕۆژئاوا تەواو کردبوو.

دووبارە هەڵبژاردنەوەی ڕەفسنجانی ١٩٩٣ بەسەرۆک کۆمار ئاوێزانی ناڕەحەتییەکی بەرچاو بوو. لەو هەڵبژاردنانەدا تەنها ٦٣٪ دەنگە بەشداربووەکانی هێنایەوە، کە دەیکردە ٥٦,٩٪ سەرجەمی ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەبوو.

بەشێوەیەکی دیکە دەتوانین بڵێین ڕەفسنجانی لە ساڵی ١٩٩٣دا تەنها لە لایەن ٣٥,٨٪ خەڵکی ئێرانەوە پشتیوانی لێ کرا. هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ١٩٩٧ زۆر سەرنج ڕاکێشتر بوون لە جاران، بەڵێ زۆر سەیر و سەمەرەتریش بوون، چونکە سەرۆک کۆماری کارا ڕەفسنجانی بەپێی دەستوور بۆی نەبوو بۆ جارێکی تر خۆی کاندید بکاتەوە (بەڵام دواتر کرا بەسەرۆکی ئۆرگانێکی زۆر بەدەسەڵات بەناوی "مصلحت تشخیص نظام"، کە لە ساڵی ١٩٨٩ بەدواوە دەسەڵاتی یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکانی نێوان پەرلەمان و شورای نیگهبانی پێ سپێردرا بوو). بۆیە لە بری ئەم کاندیدێکی تر هاتە ژوورەوە ئەویش بریتی بوو لە کاندیدی نافەرمی ڕژێم، سەرۆکی پەرلەمان ناتیق نوری کە لە لایەن خامەنەیی ڕابەر و فراکسیۆنی کۆنسێرڤاتیڤی ناو پەرلەمان و "بازاڕ" وە basaris پشتیوانی لێ دەکرا. لە کۆی ٢٣٨ کاندید (کە ٩ دانەیان ژن بوون) شورای نگهبان تەنها ناوی ٤ پیاوی پەسەند کرد و ڕێگای دان کە بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن. بەڵام سەرئەنجامی هەڵبژاردنەکان سەرکەوتنێکی چاوەڕوان نەکراو

بوو بۆ محەمەد خاتەمی کە توانی نزیکەی ٦٩٪ دەنگەکان لەو هەڵبژاردنانەدا بۆ خۆی درەو بکات، بەرامبەر بەکەمتر لە ٢٥٪ بۆ ناتیق نوری. ئەم هەڵبژاردنە وەکو خۆپیشاندانێک و نارەزایی دەربرینێک وا بوو لە دژی سیاسەتەکانی رژێمی کارا و لە پێش هەموو شتێکیشەوە بەرزبوونەوەی نرخەکان.

خاتەمی وەک ئاینپەروەرێکی بەتوانایەکی بەپێشینەیەکی پاکەوە کە بەهیچ شێوەیەک نەدەکرا نیشانەی پرسیاری بخرێتە سەر، خۆی هاوێشتە نێو هەڵبژاردنەکانەوە. خاتەمی خوێندنە ئاینییەکانی خۆی لە قوم تەواو کردبوو، پێشناوی "سەید"یش کە ئەو هەیبوو مانای ئەوە بوو کە پشتاوپشت دەگەڕایەوە سەر نەوەی پێغەمبەر. خاتەمی زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی زۆر بەباشی دەزانی و دوو کتێبیشی لەسەر فەلسەفەی سیاسەتی ڕۆژئاوا نووسیبوو. هەروەها بەر لە شۆڕشی ١٩٧٩ لە شاری هامبۆرگ سەرۆکی سەنتەری ئیسلامی بوو.

لەو کاتەدا کە لە حکوومەتەکەی ڕەفسنجانی لە نێوان ١٩٨٩ - ١٩٩٢ وەزیری ڕۆشنبیری بوو، بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە توانای سنگ فراوانی و تەحەمولکردنی بیر و بۆچوونە جیاوازییەکانی هەبووە و لە هەمان کاتیشدا ڕادەی سانسۆرکردنی کتێب و ڕۆژنامە و فیلمەکانی کەم کردبووەوە. لە کەمپەینیی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٧دا داوای تەحەمولکردنی هەرچی زیاتری بیر و بۆچوونە جیاوازەکانی دەکرد، داوای ئەوەی دەکرد کە دەسەڵاتدارانی وڵاتە ڕێز لە یاسای بنەڕەتی ئێران بگرن، پشتیوانی لە ئازادی و مافەکانی مرۆڤ دەکرد، پشتیوانی لە یەکسانی و بەرابەری نێوان ژن و پیاو دەکرد و لەگەڵ ڕۆژئاواشدا خوازیاری دیالۆگێکی کولتووری بوو.

ئەو سەرکەوتنە چاوەڕوان نەکراوەی خاتەمی لە ئەنجامی پشتگیریکردنی چەپەکان و گروپە ١٦ لایەنێکەوە بوو، هەروەها لە ئەنجامی پشتیوانییەکی

زۆری چینی ناوەڕاستەوە بوو کە لە ناوچە لادێنشینەکانەوە بەرەو شار کۆچیان کردبوو، هەروەها پشتیوانی تێکنۆکرات و بازنە پیشەسازییەکان و خوێندکاران و لاوەکانەوە بوو (هەموو کەسێ کە تەمەنی ١٥ سالان بێت بۆی هەیە دەنگ بدات). ئەم هەڵبژاردنە نیشانەی پشتیوانیکردن بوو لە بەردەوامبوون لە ئاساییکردنەوەی سیاسەتەکانی ئێران:

پلورالیزم (بەلام لە چوارچێوەی سیستمی ئیسلامیدا) بەشێوەیەکی ئاشکرا دانی پێ دانرا، گروپە هەمەجۆرەکان توانیان کاندیدەکانی خۆیان ئاشکرا بکەن، هەر چوارە کاندیدەش توانیان بەشێوەیەکی ئاشکرا گفتوگۆ لەسەر مەسەلە سیاسییەکانی ناوخۆ و دەرەوەش بکەن، هەروەها ڕێژەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکەدا گەیشتە ئاستێکی زۆر بەرز (سەرووی ٨٨٪).

خاتەمی دوا بەدوای سەرکەوتن لەو هەڵبژاردنەدا یەکسەر حکوومەتێکی لیبرالّ ئامێزی دەسنیشان کرد و بۆ یەکەمین جار لە مێژووی ئێرانیشدا ژنێکی بەجێگری سەرۆک کۆمار دەسنیشان کرد. Tehran Times کە زمانحالّی ڕژێم بوو لە نۆڤەمبەری ١٩٩٧دا داوای دەوڵەتی یاسا و تایبەتیزەکردنی پیشەسازییە لاوازەکان یا "نەخۆشەکانی" کەرتی گشتی و بنبڕکردنی خزمپەرستی و فروفێڵی باج و ئەو گەندەڵییە بەربلاوەی دەکرد کە بەشێوەیەکی ئاشکرا لە ئێراندا تەشەنەیان کردبوو.

بەلام لە هەموو ئەو هەولانەی کە خاتەمی لە نێوان ١٩٩٧ - ٢٠٠٠دا دای لە پێناوی لیبرالیزەکردنی ئێران لە ڕێگەی سیاسەتێکی "ریفۆرمخواز"ەوە لە چوارچێوەی سیستمی ئیسلامیدا سەرنەکەوتوو بوو. بەرەنگاربوونی ئەم هەولانەی خاتەمی لە لایەن "هەرە کۆنسێرڤاتیڤەکان"ەوە کە خامەنەیی ڕابەری دەکرد، ئەوەندە بەهێز بوو کە توانی سەرئێشەیەکی یەکجار سەخت بۆ خاتەمی دروست بکات. کۆنترۆڵکردنی ئۆرگانەکانی شۆڕش، سوپا، دەزگاکانی ئاسایش

(اطلاعات)، شورای نگهبان، دادگاکان، هەروەها ڕادیۆ و تەلەفزیۆن لە لایەن خـــودی ڕابەرەوە بـووە هۆی نیـــوترالکردنی ئەو هاوپەیمانە ریفۆرمخوازەی خاتەمی کە زۆرینەی مەجلیسیان (پەرلەمان) پێک دەهێنا.

تاقە قازانجی خاتەمی کە لە پیادەکردنی سیاسەتە ریفۆرمخوازەکەیەوە ماوەتەوە ئەوەیە کە ئازادی بیروڕا لە بواری ڕۆژنامە و گۆڤار و فیلمدا پەرەی سەندووە. بەڵام کاتێ ئەو زۆرینە ریفۆرمخوازەی ناو پەرلەمان لە ساڵی ٢٠٠٠دا ویستـیان ئەو ئازادیە لە چوارچێوەی یاسایەکی ڕۆژنامەگەری نوێدا بەرجەستە بکەن، ڕووبەڕووی ڤیتۆیەکی ڕاستەوخۆی ڕابەر بوونەوە. ئەم ڤیتۆیە بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەوەی بۆ خەڵک ڕوون کردەوە کە دەسەڵاتی ڕاستەقینە و کۆتایی تاوەکو ئێستاش لە دەستی ڕابەر دایە.

خۆپیشاندانەکانی خوێندکاران بەدرێژایی ٢٠٠١ - ٢٠٠٣ سستی و پاسیڤی خاتەمیان داخ کرد. هەوادارەکانی ریفۆرم لەوە بەدواوە لە بەرگریدا بوون و خودی خاتەمیش بەشێوەیەکی زۆر سەیر پاسیف و سست بوو. زۆرێک لە ئێرانییەکان خۆزگەیان دەخواست کە خاتەمی ببووایە بەگورباچۆڤی ئێران. بەڵام بەدڵنیاییەوە خودی خاتەمیش ئەوەی لە بەرچاو گرتبوو کە هەوڵەکانی گورباچۆڤ لە پێناوی دیموکراتیزەکردنی یەکێتی سۆڤێت لە چوارچێوەی سیستمی کۆمەنیستیدا بەکوێ گەشت. ڕوخانی یەکێتی سۆڤێت و خودی کەسی گورباچۆڤ ئەوەندە دڵخۆشکەر نەبوون تا کار بۆ دیموکراتیزەکردنێکی ڕادیکاڵی لەو بابەتەی ئێران بکرێ.

## ئیدارەکان و سەربەخۆییی ناوچەکان

لە ساڵی ١٩٨٩وە سەرۆک کۆماری ئێران بەشێوەیەکی فەرمی حکوومەت (ئەنجومەنی وەزیران) دەسنیشان دەکات. ئەنجومەنی وەزیران بریتییە لە زیاتر لە ٢٠ وەزیر کە بەرپرسیارن لە وەزارەتەکانی خۆیان. هەموو وەزیرێک دەبێ لە لایەن مەجلیسەوە پەسەند بکرێ. بەهەمان شێوەش مەجلیس (پەرلەمان) بۆی هەیە وەزیرەکان ناچار بکات (لە ڕێگەی ئاشکراکردنی بێ متمانەیی مەجلیس بەو وەزیرانە) کە دەست لە کارەکانی خۆیان بکێشنەوە. پرسی بێ متمانەیی مەجلیس تاوەکو ئێستا زیاتر لە جارێک بەکارهێنراوە.

سیستمی ئیدارەکانی (بەڕێوەبردن) ئێران زۆر نەریتییە و بەشێوەیەکی سەنتراڵ لە تارانەوە بەڕێوە دەبرێ. شۆڕشی ١٩٧٩ بووە هۆی ئەوەی هەندێ لە دەسەڵاتەکان (بەلایەنی کەمەوە لەو کاتە ئاژاوەئامێزەی سەرتاکانی شۆڕشدا) دیسەنترالیزە بن (نامەرکەزی). هەندێ لە ڕابەرەکانی شۆڕش ئەوەیان ڕاگەیاند کە بەشداریکردنێکی زۆر ئەکتیڤانەی جەماوەر لە ئاستی ناوچەییدا (لۆکاڵ) تەنها مەرجێکە کە بتوانێ گەرەنتی بەردەوامبوونی شۆڕش بکات. هەروەها گفتی ئەوەش درا کە ناوچەکان بۆیان هەبێ شورای جەماوەریی خۆیان هەڵبژێرن. هاتنە کایەوەی ئەو هەڵبژاردنە ناوچەییانە لە ساڵی ١٩٩٩دا بوونە واقیع. مەبەستیش لەم کارە ئەوە بوو کە شورای ناوچەکان بتوانن مەڵبەندەکانی دەسەڵات بەشێوەیەکی دیموکراسی هەڵبژێرن و بیهێننە کایەوە. هەروەها لەوانەیە مەبەستیش ئەوە بووبێت ڕێگای کەمینە نەتەوەییەکانی تر بدرێت (لەسەر ئاستی هەرێمەکان) کە دەست بەسەر دەسەڵاتی هەرێمەکانی خۆیاندا بگرن.

هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٩ بۆ ریفۆرمخوازەکان هەڵبژاردنێکی

ڕاستەقینە و پڕ بایەخ بوو، چونکە لە ئەنجامدا توانییان دەست بەسەر زۆربەی زۆری پۆستی سەرکردایەتی ئەنجومەنی شار و لادێکانی ئێراندا بگرن. تەواوی ئەو ١٥ مەنداتەی کە شاری تارانیان بەڕێوە دەبرد (کەسێ دانەیان ژن بوون) کەوتە دەست ریفۆرمیستەکانەوە.

دوای شۆڕشی ١٩٧٩ لە ناو سەرجەمی دەزگا ئیدارییەکانی ئێراندا ئۆرگانە تازەکانی شۆڕش هەن، بەتایبەتیش کۆمیتەکانی شۆڕش کە بە"کۆمیتە" komiteh ناسراون. زۆر جار دەسەڵاتی ڕاستەقینە لە دەست ئەندامەکانی ئەو کۆمیتانە دایە. دیاریکردن و دەسنیشانکردنی ئەم خاوەن دەسەڵاتانە لە ناو دەزگای بیرۆکراسی ئاڵۆزی ئێرانیدا کارێکی زۆر ئاسان نییە، بەتایبەت بۆ یەکێکیش کە ئێرانی نەبێ.

ئەوەی پێویست بێت زۆر جار ئەو زانیاریانەیە کە پەیوەندی بەباندی ئاڵۆزی خزمایەتی ئەو ئیلیتەوە هەبوو کە خاوەنی دەسەڵات بوون. بەشێوەیەکی گشتگیر دەتوانین ئەوە بڵێین کە شۆڕشی ١٩٧٩ ئیلیتێکی هێنایە سەر تەختی دەسەڵات کە بەزۆری لە توێژێکی ناو شیعە ڕوحانیەکان (Ulama) پێکهاتبوو. ئەم توێژە ئێستا دەستیشی بەسەر ئیدارە و هێزی بەرگری و ئۆرگانەکانی ئاساییشیشدا گرتووە، بەلایەنی کەمەوە ئەو دەزگا نوێیەی بۆ پۆلیسی نهێنی savama (سازمان اطلاعات و امنیت ملی ایران - و) دروستکراوە.

بەشێکی گەورەی ئەم ئیلیتە نوێیە سەر بەچینی ناوەڕاستە و بەزۆریش لە نێو بازرگانەکانەوە (بازاڕ) هاتوون. لە کاتی شاهیشدا بەهەمان شێوە ئەندامی خێزانە تازەکانی نێو ئەو ئیلیتە خۆیان بەناو ئیدارە و زانا ئاینییەکان و (Ulama) ئۆرگانەکانی شۆڕشدا بڵاو کردبووەوە. دەوڵەمەندترین دەزگا ئابوورییەکانی ئێران ئێستا بۆتە ڕێکخراوێک بۆ چەوساوەکان بەناوی (بونیادی موستەزعەفین)ەوە کە ئەمڕۆ بەلایەنی کەمەوە نزیکەی ٤٦٠ کارخانە و ڕێکخراوی شەهید (بونیادی شەهید)

کـۆنتـڕۆڵ دەکـات. پۆسـتی هەرە بەرزی ناو ئەم دوو ڕێکخـراوەیە و کارخانەکانی سەر بەمانیش لە دەستی "بازاڕ" دایە. ئەم بونیادی شەهیدانە تەنها لە بەرامبەر خامەنەیی ڕابەردا بەرپرسیارن و کۆنترۆڵکردنی باری داراییشیان لە دەستی پەرلەماندا نییە.

ئێران لە ڕوانگەی ئیدارییەوە کراوە بە ٢٥ پارێزگاوە کە پێی دەڵێن ئوستان ostan. هەر ئوستانە و لە لایەن فەرمانڕەوایەکەوە (ئوستاندار) بەڕێوە دەبرێ. ئوستانەکانیش لە ڕێگەی خۆیانەوە کراون بەچەندین شارستانەوە shahrestan کە هەر یەکە و لە لایەن فەرماندارێکەوە far-mandar بەڕێوە دەبرێ. سەرجەمی ئوستاندارەکان و فەرماندارەکان لە لایەن وەزارەتی ناوخۆی تارانەوە دیاری دەکرێن و هەمووشیان بەرامبەر بەو وەزارەتە بەرپرسیارن. لە دوای شۆڕشی ١٩٧٩شەوە لە هەموو ناوچەیەکدا ئیمام جومعەیەک imamjumá هەیە کە لە ڕاستیدا بەهاوکاری لەگەڵ پاسداران (پاسەوانانی شۆڕش) و کۆمیتە (کۆمیتەکانی شۆڕش) خاوەن دەسەڵاتی ڕاستەقینەیە لەو ناوچەیەدا[٢٥].

## پێکهێنانی ڕای گشتی

دوا بەدوای پێکهێنانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ ڕێکخراوە ئایینییەکان دەستیان بەسەر زۆربەی ئەو کارانەدا گرت کە لە ڕۆژئاوادا ئۆرگانە سێکولارەکان جێبەجێیان دەکرد. مزگەوتەکان و ڕێکخراوە ئارەزوومەندەکانی سەر بەم مزگەوتانەش ڕۆڵێکی گەورە لە پێکهێنانی ڕای گشتی سیاسییدا دەگێڕن. لە ناو قوتابخانەکاندا، زانکۆکاندا، ئیدارە و کارخانەکاندا چەندین ڕێکخراوی ئیسلامی هەن کە هەمان ئەو ڕۆڵە دەگێڕن کە لە وڵاتە سێکولارەکاندا ئۆرگانە سیاسییەکان و (یا) سەندیکاکان دەیگێڕن.

یاسای بنەڕەتی (دەستوور) ئێران لە بواری چاپ و بڵاوکردنەوە و (مادەی ٢٤)[٢٦] هەروەها لە بواری ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیشدا (مادەی ١٧٥)[٢٧] وەکو پرنسیپ گەرەنتی ئازادی بیروڕاکانیان دەکرد، بەمەرجێ ئەو ئازادییە دژی نۆرم و پێوەرە بنەڕەتییەکانی ئیسلام نەبێ. هەموو ڕۆژنامەیەک بەر لە دەرچوونی دەبێ مۆڵەتی کارکردنی هەبێ. ئەم شێوە کارە لە پراکتیکدا بووە هۆی ئەوەی تەواوی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئێران تا ماوەیەکی دوورودرێژ پشتیوانی لە پرنسیپە بنەڕەتییەکانی شۆڕشی ئیسلامی بکەن. سەرجەمی ئەو ئۆرگانانەی بەڕاستی بەرهەڵستکار بوون لە سەرەتای هەشتاکاندا داخران.

تەواوی ڕۆژنامە گەورەکان لە تاراندا چاپ دەکرێن، بەڵام تیراژی هەر هەموویان بەسەر یەکیشەوە ژمارەیەکی زۆر کەمە. ڕۆژنامەی کیهان (جیهان) کە گەورەترین ڕۆژنامەیە و لە ساڵی ١٩٤١دا دامەزراوە، تەنها ٣٥٠٠٠٠ دانەی لێ چاپ دەکرێ. ڕۆژنامەی اطلاعات (زانیاری) کە بەپۆشتەترین ڕۆژنامە دەژمێردرێ، بەتیراژی ٢٥٠٠٠٠ دانە دەکەوێتە بازاڕەوە. ڕۆژنامەی ئیتیلاعات کە هەمیشە لە کەیهان بەکۆنسێرڤاتیڤانەتر

له قه‌ڵه‌م ده‌درێ، له‌ ساڵی ١٩٢٥وه‌ به‌رده‌وام ده‌رده‌چێ. له‌ پاڵ ئه‌مانه‌شه‌وه‌ دوو ڕۆژنامه‌ی ئینگلیزی زمانی زۆر باش به‌ناوی Tehran Times و Kay-han International وه‌ ده‌رده‌چن. تاران تایمز ئه‌ورۆ زۆر به‌ڕوونی نماینده‌گی خه‌تی "ریفۆرمخوازی" خاته‌می ده‌کات، به‌لام که‌یهان ئینته‌رناسیونال، هه‌ندێ جار به‌شێوه‌یه‌کی زۆر سه‌رنج ڕاکێش، ته‌فسیری بیر و بۆچوونی "کۆنسێرڤاتیڤه‌ کلاسیکییه‌کانی" ده‌کرد.

به‌ڵام دوا به‌دوای سه‌رکه‌وتنی خاته‌می له‌ هه‌ڵبژاردنه‌کانی ١٩٩٧دا، بارودۆخی ڕۆژنامه‌ و گۆڤاره‌کان به‌شێوه‌یه‌کی دراماتیکی گۆڕان. حکوومه‌ته‌که‌ی خاته‌می به‌شێوه‌یه‌کی خێرا مۆڵه‌تی ده‌رچوونی به‌ژماره‌یه‌کی یه‌کجار زۆری ئه‌و ڕۆژنامانه‌ به‌خشی که‌ پشتیوانیان له‌ خه‌تی ریفۆرم ده‌کرد. بۆیه‌ کۆمه‌ڵه‌ ڕۆژنامه‌ و گۆڤارێکی یه‌کجار زۆر که‌ به‌خۆیانیان ده‌وت "ریفۆرمخوازی بێ لایه‌ن" ده‌ستیان به‌بلاوکردنه‌وه‌ کرد. له‌م بلاوکراوانه‌دا دیباتێکی زۆر ئازادانه‌ (ته‌نانه‌ت له‌ باره‌ی مه‌سه‌له‌ هه‌ره‌ جیدال ئامێزه‌کانی کۆماری ئیسلامیشه‌وه‌) پیاده‌ کرا. کار گه‌یشته‌ ئه‌وه‌ی بنه‌ما هه‌ره‌ بنه‌ڕه‌تییه‌کانی کۆماری ئیسلامیش بخرێته‌ ژێر پرسیاره‌وه‌:

که‌سایه‌تی بێ هه‌ڵه‌ و بێ خه‌وشی خومه‌ینی، هه‌ڵبژاردنی نادیموکراسیانه‌ی ڕابه‌ر و ئه‌و ده‌سه‌لاتانه‌ی ئه‌و هه‌یبوو که‌ به‌هیچ شێوه‌یه‌ک نه‌ده‌کرا نیشانه‌ی پرسیاری بخرێته‌ سه‌ر، ڕۆڵی ئایین له‌ سیاسه‌تدا و هه‌وڵی جیاکردنه‌وه‌ی ئایین له‌ ده‌وڵه‌ت، ناسه‌ربه‌خۆیی ئافره‌ت له‌ ژیانی تایبه‌تی خۆیدا، هه‌روه‌ها گۆشه‌گیرکردنی ئێران له‌ لایه‌ن ڕۆژئاواوه‌. له‌ کۆتاییشدا کاره‌کان په‌یوه‌ندییان به‌وه‌وه‌ هه‌بوو که‌ ئایا ده‌کرێ ئێران به‌شێوه‌یه‌کی ڕاسته‌قینه‌ دیموکراتیزه‌ بکرێ یا نا؟

له‌م کاتانه‌دا هه‌موو ئه‌و ده‌سه‌لاتانه‌ی ماسمێدیاکان و پرۆسه‌ی پێکهێنان و سازدانی ڕای گشتی له‌ ئێراندا به‌ڕێوه‌ ده‌برد به‌شێوه‌یه‌کی مه‌رکه‌زی کۆنترۆڵ کرابوون. به‌لام له‌ هه‌مان کاتدا ڕژێمی ئیسلامی وای هه‌ست ده‌کرد

بەهۆی بەربڵاوی ئازادی بیروڕا و بڵاوکردنەوەوە تەواوی ڕژێمەکە لە ژێر هەڕەشەدا قەراری گرتووە. لە نێوان ۲۰۰۰ - ۲۰۰۳دا هێرشێکی زۆر توندوتیژی پێچەوانە لە لایەن نمایندە کۆنسێرڤاتیڤەکانی ڕژێمی ئیسلامییەوە دژ بەحکوومەتی فەرمانڕەوای ئێران پیادە کرا: دەیەها ڕۆژنامە و گۆڤاری بێ لایەن و ریفۆرمخواز لە لایەن دادگا ئایینییەکانەوە داخران، زیاتر لە ۱۰۰ ڕۆژنامەوان و نووسەر و سیاسەتوانی بێ لایەنیش گیران و دەیەهاش بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن زیندانی کران.

زۆرێک لە ڕۆژنامە ریفۆرمخوازەکان سەرلەنوێ لە ژێر ناوێکی نوێدا دەستیان بەکار کردەوە. وا پێ دەچوو (لە مای ۲۰۰۱) تیراژی ئەم ڕۆژنامانە دوو ئەوەندەی تیراژی سەرجەمی ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی ئۆرگانە هەرە کۆنسێرڤاتیڤەکانی تر بوون کە گوزارشیان لە بیر و بۆچوونی ڕژێمی ئیسلامی دەکرد. ئەمە دەکرێ وەکو نیشانەیەکی گۆڕانی دەسەڵات لەسەر ئاستە جەماوەرییەکەی، تەماشا بکرێت. بەڵام پێکهاتەی کۆنسێرڤاتیڤانەی وڵاتەکە بەهەموو شێوەیەک هەوڵی ڕاگرتنی ئەو گۆڕانکارییەی دەدا.

ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ئێران (بەسێ ئێزگەی ڕادیۆ و دوو کەناڵی تەلەفزیۆنەوە)، لەگەڵ ئیرنا IRNA (Islamic Republic News Agency) کە تاقە ئاژانسی هەواڵی ئێرانە، هەرسێک لە لایەن دەوڵەتەوە کۆنترۆڵ کراون. لە ڕێگەی مۆنۆپۆلی "ئیرنا"وە هەواڵەکان بەسەرتاسەری ئێراندا دابەش دەکرێن و سانسۆری هەموو ماسمێدیاکانیش دەسنیشان دەکرێن، بۆیە سەرجەمی هەواڵ و ڕاپۆرتەکان یەک فۆرمیان هەیە و لەگەڵ خەتی فەرمی ڕژێمیشدا لەیەک دەچن. جیاوازییەکی زۆر کەم لە بواری ڕاپۆرتە هەواڵەکانی هاوپەیوەند بەسیاسەتی ناوخۆی ئێرانەوە بەدی دەکرێ.

شەڕە دەسەڵاتی ناو تاران لە ڕاپۆرتە هەواڵەکانی مەڵبەندی دەسەڵاتە جوداکاندا ڕەنگی داوەتەوە. هەر بۆ دڵنیایی زیاتر خزمەکانی ڕەفسنجانی

تا ١٩٩٣یش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ چاودێری ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ئێرانیان دەکرد. بەڵام لە ساڵی ١٩٩٣دا خامەنەیی ڕابەر، سەرۆکی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی (برا بچووکی ڕەفسنجانی) لە کار دەرکرد چونکە سەرکەوتوو نەبوو لە بەرپەرچدانەوەی پڕوپاگەندەکانی دوژمندا. ئەم کارەی خامەنەیی شتێکی لەناکاو نەبوو، بەڵکو دوای ئەوەی باڵی "هەرە کۆنسێرڤاتیڤ"ی ناو پەرلەمان ڕەخنەیەکی زۆریان بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن ئاراستەی براکەی ڕەفسنجانی کرد، هاتە دی. ئەم باڵە پێیان وابوو سەرۆکی تەلەفزیۆنی ئێران ڕێگەی بۆ "هەندێ فیلمی گەندەڵ ئامێز و بێ ئەخلاقی بۆگەندی ڕۆژئاوا" خۆش کردبوو.

لە جەنیوەری ١٩٩٥دا بەیارمەتی هەمان گروپە ئیسلامییەکانی ناو پەرلەمان (هەرە کۆنسێرڤاتیڤەکان) یاسایەکیان پەسەند کرد کە بەپێی ئەو یاسایە هاوردن و فرۆشتن و بەکارهێنانی پەرەبول (سەتەلایت) بۆ سەیرکردنی تایبەت قەدەغە کرا. ئەو سەدەها هەزار سەتەلایتەی کە تا ئەو کاتە لە ئێراندا هەبوون دەرفەتی ئەوەی بۆ خاوەنەکانیان ڕەخساندبوو کە بتوانن بەهۆیەوە چەندین پرۆگرامی ئاسیایی و ڕۆژئاوایی ببینن. ئەو کۆنسێرڤاتیڤانە پێیان وا بوو ئەو پرۆگرامانە بوونەتە هۆی لێکەوتنەوەی زیانێکی کولتووری. بەڵام تاوەکو ٢٠٠٣یش سەتەلایتەکان وەکو خۆیان مابوون و ڕژێمی ئێرانیش تا دێ لە بواری قەدەغەکردنی بڵاوبوونەوەی ئینتەرنێتدا ڕووبەڕووی قورساییەکی زیاتر دەبێتەوە.

ئەوڕۆ ژمارەیەکی زۆری چایخانە - ئینتەرنێت (سەنتەری ئینتەرنێت) لە ئێراندا هەن، بەڵام بەزۆری لە تاراندا چڕ بوونەتەوە. ئەوڕۆ ئینتەرنێت بۆتە یەکەمین سەرچاوەی زانیاری سانسۆر نەکراوی ئێران کە هاوڵاتیانی ئێرانی دەتوانن سوودی لێ ببینن. ئەم سەرچاوەیە بەتایبەت لە نێو لاوەکاندا، هەوادارێکی یەکجار زۆری هەیە. دەبێ ئەوەش یاداشت بکەین کە ٦٩٪ی ئێرانییەکان لە خوار تەمەنی ٣٠ ساڵەوەن.

کتێبەکان پێش چاپ بوونیان سانسۆر ناکرێن، بەڵام کتێبە نائیسلامییەکان دەشێ دەستیان بەسەردا بگیرێ. ئەم کارە بۆتە هۆی ئەوەی سانسۆرکردنی کتێبەکان لە لایەن خودی دەزگاکانی بڵاوکردنەوەوە بەڕێوە بچێ.

## ئازادی و مافەکانی مرۆڤ

### دۆزی سەلمان روشدی

رۆمانی ئایەتە شەیتانییەکانی The Satanic Verses سەلمان روشدی لە پایزی ١٩٨٨ لە شانشینە یەکگرتووەکان چاپ کرا. ناونیشانی رۆمانەکە ئاماژە پێ کردنێکە بۆ تەفسیری جەنجاڵ ئامێزی یەکێک لە ئایەتەکانی پەنجا و سێیەمین سورەتی قورئان (سورە النجم - و) کە تیایدا باس لەو سێ خواوەندە دەکا کە خەڵک لە مەککە دەیپەرستن. لەوێدا ئەوە نووسراوە کە ئەوانە "جگە لە ناو هیچی تر نین"، واتە بوونیان نییە. بەڵام هەندێ لە شیکارە عەرەبەکان لە قۆناغێکی زۆر سەرەتاییدا باسی ئەوەیان کردووە کە گوایە کاتێ محەمەد ئەم وەحیەی بۆ هاتووە شەیتان بەگوێیدا چرپاندوویەتی "ئەمانە ئەو قوانەن کە مرۆڤ هیوا بەدوعاکانیان دەخوازێ". ئەم ئایەتە جارێکی تر نەخراوەتە روو چونکە ئایەتێکی شەیتانی بووە. هەندێ بەشی رۆمانەکەی روشدی (بۆ موسڵمانەکان - و) ئیهانەت ئامێز بوو. روشدی لەم رۆمانەدا شکستی کەسایەتی و شیزۆفرینیای یەکێک لە پاڵەوانە سەرەکییەکانی ئەم رۆمانە (کە ناوەکەی لە ناوی جبرائیلەوە وەرگیراوە) شی دەکاتەوە. لە خەیاڵ و خەونەکانی خۆیدا شێوەیەکی نەناسراو دەردەکەوێ و باسی سەرەتاکانی مێژووی محەمەد و ئیسلامی بۆ دەکات. ئەم کارە دواتر (لە لایەن موسڵمانەکانەوە - و) بەکارێکی زۆر کوفر ئامێز لە قەڵەم درا.

لە ساڵی ١٩٨٩دا و هاوکات لەگەڵ یادکردنەوەی ساڵانەی شۆڕشدا هەندێ میوان کە لە شانشینە یەکگرتووەکانەوە هاتبوون چەند لاپەڕەیەکی یەکجار ئیهانەت ئامێزی رۆمانەکەی روشدییان خستە بەردەستی ئایەتوڵڵا خومەینی داوای ئەوەیان لێ کرد فەتوایان لەسەر بدات.

وەڵامەکەی (فەتوا) خومەینی کە لە ١٤ی فابریوەری درایەوە باسی لەوە دەکرد کە نووسەری ڕۆمانەکە ئەتک و بێ حورمەتی بەپێغەمبەر و بەئیسلام کردووە و کوفرێکی وای کردووە کە شایەنی سزای مەرگە.

ئەم فەتوایە بەدڵی سەرانی تاران بوو. لە ساڵی ١٩٨٨دا ئێران بڕیاری ئاگربەستی لەگەڵ عێراقدا قبوڵ کرد. ئێران بەو شێوەیە کۆتایی بەو شەڕە هێنا کە خۆیان وتەنی شەڕی خودا بوو، شەڕی ئیسلام بوو لە دژی ڕژێمی شەیتانی و "تاغوت"ی عێراق لە بەغدا، شەڕێک بوو کە دەبوو مرۆڤ بێ سازشکردن تا سەرکەوتن یا تا شەهیدبوون خەباتی تێدا بکا. قبوڵکردنی ئەو ئاگربەستە لەو کاتەدا مانای لە دەستدانی ئەو ئیعتیبارە بوو کە (ڕژێمی ئیسلامی ئێران - و) هەیبوو، وەکو پڕوپاگەندەش بەڕوونی مانای دۆڕاندنی شەڕەکە بوو.

ڕژێمەکانی نێو جیهانی ئیسلامی پشتیوانیان لە ئێران و شۆڕشی ئیسلامی ئێران نەکرد. لەبری ئەوە لە دەوری ئیدارەی سعودی لە مەککە و مەدینە کۆبوونەوە و (کە بۆ خۆی شتێکی سیمبۆلی گرینگ بوو) خۆیان لەو تەفسیرە شۆڕشگێڕییەی ئێران هەیبوو بۆ ئیسلام، دوورەپەرێز ڕاگرت. ئەو فەتوایەی خومەینی بووە هۆی ئەوەی سەرانی تاران سیمبۆلێکیان بەدەستەوە بێت بۆ ئەوەی لە بەرامبەر ڕای گشتیدا بەکاری بێنن. ڕژێمی ئێران خەڵاتێکی گەورەی بۆ ئەو کەسە دانا کە بتوانێ بڕیاری مەرگی سەلمان روشدی جێبەجێ بکا، بەمەش مەسەلەکە دەنگ و سەدایەکی زۆر گەورەی بۆ خۆی پەیدا کرد. بەم شێوەیە ڕژێمی ئیسلامی ئێران توانی لە بەردەم ڕای گشتی ئیسلامیدا خۆی (بەجیاوازی لەگەڵ ئەوانی تردا) وەکو داکۆکیکەری ئیسلام بەرجەستە بکات. ئەم کارە سوودێکی پڕوپاگەندەیی زۆری هەبوو لە بەرژەوەندی پێداگرتن لەسەر فەتواکەی روشدی و بەهای ئەو فەتوایە.

دواتر، هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، سیاسەتی ئێران جۆرە

وەرچەرخان و بەدانەوەیەکی بەخۆیەوە بینی. هۆکارە ئابوورییەکان زیاد لە هەموو فاکتەرەکانی دیکە هۆیەک بوو بۆ ئەوەی ئێران بەناچاری پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەورووپا و وڵاتەکانی تری نێو جیهانی ئیسلامیدا چاکتر بکاتەوە. ئەو بارودۆخە ستراتیژییەی کە بەدوای ناکۆکییەکانی عێراق - کوەیتدا هاتە ئاراوە ڕێگەی بۆ ئەم کارە خۆش کرد. نزیکبوونەوەی ئێران بەهۆی بەشداریکردنی لە زیارەتی مەککەدا مانایەکی سیمبۆلی هەبوو، بەم شێوەیەش ئێران پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سعودیەدا ئاسایی کردەوە. هەروەها ئێران بەشداری کۆبوونەوە و کارەکانی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی کرد. نزیکبوونەوەی ئێران لە سعودیە گەیشتە ئەوەی وەزیرەکانیان لە ساڵی ٢٠٠٠ و ٢٠٠١دا سەردانی یەکتر بکەن. وەزیری دەرەوەی سعودیە بەر لەوەش (١٩٩٩) سەردانی تارانی کردبوو.

بەم شێوەیە دۆزی روشدی گرینگی پڕوپاگەندە ئامێزی خۆی بەنیسبەت ئێرانەوە لە ناو جیهانی ئیسلامیدا لە دەست دا. نەک هەر ئەوە بەڵکو ئەم دۆزە تا دەهات دەبووە هۆی بارگرانییەکی زۆرتر بۆ ئێران لە بەردەم هەوڵەکانی تاران لە پێناوی پاشترکردنەوەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا. لە هەمان کاتیشدا لەبەر هۆکاری سیاسی ناوخۆی ئێران کارێکی مەحاڵ بوو کە فەتواکەی ڕابەری کۆچکردووی شۆڕشی ئیسلامی ڕەت بکرێتەوە.

دۆزی روشدی هاوکات لەگەڵ سۆراخکردنی نێودەوڵەتییانەی مافەکانی مرۆڤ لە تاران جارێکی تر زیندوو بووەوە. ئێمە پێشتر باسی خاڵە دژوارەکانی یاسای سزامان کرد کە ناکۆک بوون لەگەڵ جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤی سەر نەتەوە یەکگرتووەکان (مادەی ٥). هەروەها باسی ئەو جیاوازییانەشمان کرد کە سیستمی یاسایی ئێران لە نێوان پیاو و ژندا بەرقەراری کردووە، بۆ نموونە ئەو بڕگانەی پەیوەندییان بەئەرک و مافەکانی هەردوو لاوە هەیە (بۆ نموونە) لایەنە یاساییەکانی بواری خێزان (بەبەراورد

لەگەڵ مادەی ١٦ی جاڕنامەی گەردوونی).

هەروەها دەکرێ ئەمن و ئاسایشی یاسایی[٢٨] لە ئێراندا بخرێتە ژێر پرسیارەوە، چونکە ژمارەی بڕیارەکانی "سزای مەرگ" کە لە دادگاکردنە کورت و بەپەلەکانی ئێرانەوە دەردەچوو تا دەهات زیادیان دەکرد. کاتێ بڕیاری "سزای مەرگ" بەتایبەت لە بواری تاوانی مادە سڕکەرەکاندا دەدرا، دادگاکان پشتیان بەئایەتێکی قورئان دەبەست 5:37/33 (بڕوانە دەقی سورەتی المائدە، پەراوێزی ٢٢) کە تێیدا هاتبوو "ئەوانەی شەڕ لەگەڵ خودا و پێغەمبەرەکانیدا دەکەن و فەساد لەسەر زەویدا بڵاو دەکەنەوە". ئەمە هەمان ئایەت بوو کە دژی تاوانە سیاسییەکان و تاوانەکانی دژ بەئایین بەکار دەهێنرا.

ئەورۆ سەرنج و بایەخ پێدانەکان لە دەوری دوو بواری دیکە کۆبوونەتەوە: پرسی ئازادی (هەڵبژاردنی - و) ئایین و ئازادی بیروڕا. هەر کات ئایین وەک یاسای وڵات و سیستمی یاسایی چاوی لێ کرا ئەوە ڕۆڵ و وەزیفەکانی پاشخانی ئایینی (مرۆڤ سەر بەچ ئایینێکە) لەگەڵ ئەوانەی لە جاڕنامە گەردوونییەکەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە دەکەوێتە ناکۆکییەوە: (ئایین - و) هەڵبژاردنێکی شەخسی تاکە کەسەکانە (مادەی ١٨، جاڕنامە). ئەمەش کاریگەری خۆی لەسەر ستاتوی یاسایی تاکە کەسەکان بەجێ دێڵێ. ئەو کاتە ئازادی ئایین (یا ئایین هەڵبژاردن - و) وەکو "نابەرابەری لە بەردەم یاسا"دا پێناسە دەکرێ: واتە بیروباوەڕ و ئایین و ئایینزا جوداکان هەریەکە و یاسایەکی تایبەتی خۆیان بەسەر ئەندام و هەوادارەکانی خۆیاندا پیادە دەکەن، لە پێش هەموو شتێکیشەوە لە بواری کولتور و خوێندن و یاساکانی خێزاندا ئەو کارە دەکەن. ئەم مەسەلەیەش لە مادەکانی ١٢، ١٣، ١٤ی یاسای بنەڕەتیدا باسکراوە[٢٩].

هەڵبژاردنی هەر ئایینێکی تر جگە لەو ئایینە فەرمییەی دەوڵەت هەیەتی مانای سنوور بەزاندنی وەزیفە و ئەرک و مافەکان دەگەیەنێ،

چونکە دەوڵەت وەک دەستەواژەیەک بۆ گوزارش لە یەک ئایینی دیاریکراو پێناسە دەکرێ (سیستمی الذمە). بەهەمان شێوە لە ڕووی یاساکانی سزاشەوە لە کاتی غەرامەت داندا، واتە کاتێ یەکێک کەسێکی تر دەکوژێت، "جیاوازی" دروست دەکات، چونکە بڕی ئەو پارەیە (غەرامە یا جەریمە) کە بکوژەکە لەبری خوێنەکە بەکەسوکاری مردووەکەی دەدات پەیوەندییان بەو ئایینەوە هەیە کە مرۆڤ هەیەتی یا پەیڕەوی دەکات. هەروەها مەرجەکانی گەواهیدانیش پەیوەندی بەو ئایینەوە هەیە کە گەواهیدەر پەیڕەوی لێ دەکا. هەروەکو پێشتریش باسمان کرد ئەوانەی لە ئیسلام وەردەگەڕێنەوە یا کوفر دەکەن سزای مەرگیان دەدرێ.

مەرجی هاولاتیبوون ئەوەیە کە مرۆڤ سەر بەیەکێک لە ئایینە دانپێدانراوەکان بێت، واتە ئیسلام یا ئەو سێ ئایینەی تر کە لە یاسای بنەڕەتیدا دانیان پێدانراوە. بەواتایەکی دی نابێ مرۆڤ لە ئێراندا بێ ئایین بێت، یا سەر بەئایینێکی دانپێدانەنراو بێت. ئەم (نابێ)یە زیانێکی گەورەی بەبەهاییەکانی ناو ئێران گەیاند، چونکە ئەگەر نەبوونایە بەئیسلام ئەوە لە هەموو مافە یاساییەکان بێ بەش دەبوون. بەلام مرۆڤ دەبێ ئەوەش بزانێ کە پاشخانی ئایینی بەستاتۆیەکی یاسایی دەژمێردرێ. مرۆڤ پێویستە سەر بەئایینێکی دیاریکراو بێت، بەلام پێویست ناکات بڕوای پێ هەبێت. بەپێی مادەی ٢٣ی یاسای بنەڕەتی[٣٠] هیچ کەسێ بۆی نییە لە بڕوای شەخسی یەکێکی تر بکۆڵێتەوە و پرسیاری لێ بکات.

## سڕینەوەی خومەینیزم

دوای دەسەڵات گرتنە دەستی ڕەفسنجانی، باڵی ڕادیکاڵی ناو ڕژێم بەشێوەیەکی سیستماتیک لە سەنتەری دەسەڵات دوور خرانەوە. پرۆسەیەک بۆ "سڕینەوەی خومەینیزم" لە ئێران دەستی پێ کرد. ڕەفسنجانی ئەوەی ڕاگەیاند کەوا دروشمە شۆڕشگێڕییەکان بەس نین و پێی وابوو لە بری ئەوە دەبێ ئێران ببێتە ولاتێکی ئیسلامی نموونەیی لە جیهاندا. دەبێ ساڵانی نەوەدەکان ببێتە دەساڵەی بنیادنانەوەی ئابووری ئێران نەک دەساڵەی شۆڕش. دەبێ تەماح بخرێتە بەر سەدەها هەزار خوێندەواری پلە بەرز لە هەندەران بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ئێران. لە پێناوی بنیادنانەوەی ئێراندا بەهیچ شێوەیەک نابێ ڕۆڵی سەرمایە و تەکنەلۆژیای بێگانە لە بیر بکرێن. ئەو زیانە ئابوورییانەی لە ئەنجامی شەڕی هەشت ساڵەی دژ بەعێراق کەوتەوە ماڵ وێرانکەر بوون. لە پلانی پێنج ساڵەی ۱۹۹۰ - ۱۹۹٤دا بۆ یەکەمین جار لە مێژووی کۆماری ئیسلامی ئێراندا بڕیاری ئەوە درا کە ئێران بۆی هەبێ قەرز لە ولاتانی بیانی وەربگرێ.

قەیرانی عێراق - کوەیت لە ساڵی ۱۹۹۰ - ۱۹۹۱دا بووە هۆی سەرکەوتنێکی گەورە بۆ سیاسەتە پراگماتییەکانی ڕەفسنجانی. لەم قەیرانەدا ئێران وەکو ولاتێکی بێ لایەن خۆی ڕاگەیاند و هیچ نەبێ بەشێوەیەکی فەرمیش، پشتیوانی خۆی لە بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بەگەمارۆدانی ئابووری سەر عێراق، ڕاگەیاند. جارێکی تریش ئێران وەکو ئەکتەرێکی نێو بازیە دیبلۆماسییەکانی جیهان قبوڵ کرا و پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانی خۆی لەگەڵ چەندین ولاتی تردا گرێ دایەوە. دەرامەتی هەناردەی نەوت بەرەو سەرەوە دەچوو. عێراق ناچار کرا لە لایەک هێزەکانی خۆی لە تەواوی ئەو ناوچە و زەویە ئێرانیانە بکشێنێتە دواوە کە بەپێی ڕێکەوتنامەکەی ۱۹۷۵ بەسنووری دەوڵەتی ئێران

(شەتولعەرەب) دەژمێردران و لە لایەکی تریشەوە دەست بەگۆڕینەوەی دیلەکانی جەنگ بکات. هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت لە ساڵی ١٩٩١دا بووە هۆی دەستپێکردنی کار و چالاکییەکانی ئێران لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست و بەتایبەتیش لە کۆماری تاجیکستانی فارسی زمان. ئێران لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا هاوڕا بوون. بەتایبەت لە مەسەلەی خۆ دوور ڕاگرتن لە تالیبانەکانی ئەفغانستان و بەلایەنی کەمیشەوە لە مەسەلەی ئەمەگداری گروپە شیعەکانی ئەوێندەرێ کە لە لایەن تالیبانەکانەوە ڕاودەنران. لە سێپتامبەری ساڵی ١٩٩٨دا بەهۆی کوشتنی ١٠ دیبلۆماتی ئێرانی و ڕۆژنامەوانێکەوە لە ئەفغانستان قەیرانێکی سەخت قەراری گرت. لە بەرامبەر ڕوخانی ڕژێمی تالیبان لە ساڵی ٢٠٠٢دا ئێران خۆشحاڵی خۆی دەربڕی.

لە قۆناغی نەوەدەکاندا ئێران دەستبەرداری ئەو دوورەپەرێزییەی خۆی بوو کە جاران لەگەڵ هەندێ ڕژێمی نێو جیهانی ئیسلامیدا پیادەی دەکرد. لە بری ئەوە بەشێوەیەکی ئەکتیف کەوتە هاریکاریکردنی ئەو ڕژێمانە. بەهەمان شێوەش هاریکاری خۆی لەگەڵ حکوومەتی وڵاتەکانی شورای هاریکاری کەنداودا (GCC) دەست پێ کردەوە. ئێران ئەوڕۆکە بەشداری کار و چالاکییەکانی ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیش ICO دەکات. ئەم بەشداریکردنەی تاران بەتایبەت لە ساڵی ١٩٩٧دا زۆر ئاشکرا دەرکەوت بەوەی ئەم ڕێکخراوەیە توانی کۆنگرەی باڵای خۆی لە تاران ببەستێ و ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆری سەرۆک دەوڵەت و سەرۆک وەزیرانی وڵاتانی تەواوی جیهانی ئیسلامی لەو کۆنگرەیەدا بەرجەستە بکات.

لە ساڵی ١٩٩٧دا خاتەمی ئارەزووی خۆی بۆ نزیکبوونەوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاگەیاند. خاتەمی ئەم ئارەزووەی هاوکات لەگەڵ کۆبوونەوەی باڵای سەرانی ئیسلامی و لە دیدارێکی CNN یشدا ئاشکرا کرد. لەو دیدارەدا خاتەمی ئارەزووەکەی خۆی لە شێوەی پەیامێکی ڕاستەوخۆدا بۆ خەڵکی ئەمریکا دەربڕی. ئەوەی ئاستەنگی لە بەردەم

ئاساییکردنەوەیەکی تەواوی پەیوەندییەکانی ئێران - ڕۆژئاوادا دروست کردبوو لە لایەکەوە ئەو گەمارۆ ئابوورییە بوو (بەهۆی ئەوەی کە گوایە ئێران پشتیوانی لە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی دەکات) کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٩٥دا لە دژی ئێران بڕیاری لەسەر دابوو، لە لایەکی تریشەوە مەرجەکانی یەکێتی ئەورووپا بوو سەبارەت پرسی سەلمان روشدی و پرسی میکۆنۆس (ئەم پرسەی دوایی پەیوەندی بەبڕیاری دادگایەکی ئەڵمانییەوە هەبوو کە تیایدا سەرانی هەرە بەرزی ئێرانی بەوە تاوانبار کردبوو کە لە ساڵی ١٩٩٢دا دەستیان لە کوشتنی چوار بەرهەڵستکاری کورددا هەبووە لە بەرلین). لە ساڵی ٢٠٠٠دا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پچێک گەمارۆ ئابوورییەکەی سەر ئێرانی سووک کردەوە. سەردانەکانی سەرۆک دەوڵەت و وەزیرەکان ئاماژەیەک بوون بۆ ئەوەی کە ئێران چیتر ئەوەندە وڵاتێکی گۆشەگیر نییە. بەڵام پاشەڕۆژی کۆماری ئیسلامی ئێران لە کۆتاییدا، بەئەگەری زۆر پەیوەندی بەتواناکانی ڕژێمەوە هەیە کە تا چەند دەتوانێ گرفتە ئابووری و کۆمەڵایەتییە گەورەکانی ئێران چارەسەر بکا. دانیشتوانی ئێران بەشێوەیەکی سەرسام ئاوەر زیاد دەکەن. بەپێی ئامارە فەرمییەکان دانیشتوانی ئێران لە ١٨,٩ میلۆنەوە (١٩٥٦) بەرز بوەتەوە بۆ ٣٣,٧ ملیۆن (١٩٧٦) تا لە ساڵی ١٩٨٦دا گەیشتە ٤٥,٨ ملیۆن کەس. ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتوانی ئێران لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا گەیشتە ٣,٩٪ (یا ساڵی ٢ ملیۆن کەس) کە بەیەکێک لە بەرزترین ڕێژەکانی جیهان دەژمێردرێ. بەپێی لێکۆڵینەوەی دیموگرافە ئێرانییەکان دەبوو تا ساڵی ٢٠٢١ز ئێران خانوو و بژێو و کار بۆ ١٦٠ ملیۆن کەس دابین بکا.

لەو کاتە بەدواوە بەشێوەیەکی ئاشکرا گفتوگۆ لەسەر بەرزبوونەوەی سەرسام ئاوەری دانیشتوان کراوە و پرۆگرامێکی بەپێزی خانەوادەییش دەستی پێ کردووە. ئێستا بەشێوەیەکی فەرمی باس لە ڕێژەی لە دایک بوون دەکرێ و لە ساڵی ١٩٩٥یشدا ڕێژەی گەشەکردنی دانیشتوان لە

نێوان ١,٦٪ - ١,٧٪دا قەراری گرتبوو. هەموو ژنێکی ئێرانی ئەورۆ ٣,٥ منالّی دەبێ بەرامبەر بە ٧ منالّ لە سالّی ١٩٨٦دا. بەپێی ئامارە فەرمییەکانی سالّی ١٩٩٦ دانیشتوانی ئێران خۆیان لە ٦٦ ملیۆن کەس دەدا کە لە نێویاندا ٥١٪ فارس بوون (واتە فارسی زمانەکان)، ٢٤٪ ئازەری بوون (لەگەلّ تورک زمانەکان) هەروەها ٧٪یشیان کورد بوون.

سەقامگیرکردنی دانیشتوانی ئێران کە کارێکی زۆر پێویستە، دەکرێ بوترێ کە لە بەرنامەدایە. ئەگەر نا کۆچکردنی خێرای گوندنشینەکان بۆ ناو شار و پێویستی زیاتر کرین و هاوردنی خواردەمەنی لە دەرەوە و بەرزبوونەوەی رادەی بێکاری وەکو هەرەشەیەک دێنە ئاراوە. "چەوساوەکانی زەوی" واتە موستەزعەفین، لە لایەن شۆرشی ئیسلامییەوە پەیمانی ژیانێکی باشتریان پێ درابوو. کەچی ستانداردی ژیان لە دوای شاوە بەئەگەری زۆر بەرەو خراپی چووە. رێژەی بێکاری و هەلاوسان ماوەیەکی زۆرە بەپێی ئامارە فەرمییەکان لە نێوان ٢٠٪ - ٣٠٪دا قەراریان گرتووە، بەلاّم بەئەگەری زۆر لە راستیدا زۆر لەوەش بەرزترە.

زۆربەی زۆری کارمەندەکانی دەولّەت ناچار بوون کە دوو سێ کار بکەن و گەندەلّیش بەناو خوێنی ئیدارەکاندا گوزەری دەکرد. پیشەسازی نەوت، بانکەکان و زۆربەی کارخانە گەورەکان خۆمالّی کران. ناچالاکی ئەم کارخانانە بووە گرفتێک لە بەردەم پرۆسەی ریفۆرمکردنی ئابووری ئێراندا. چەندین خۆپیشاندانی جەماوەری لە دژی رژێم، بەتایبەت ئەوانەی لە لایەن خوێندکارانەوە، لە سالّی ١٩٩٢وە لە شارە گەورەکانی ئێراندا ئەنجام دران. خۆپیشاندەران بەتوندترین شێوە دەستی خۆیان وەشاند، ئەمەش بۆ رژێمی ئیسلامی ئێران نیشانەیەکی خراپ بوو. بەلاّم لە هەمان کاتدا چەند نیشانەیەکی باشیش لە ئارادا بوون: پرۆگرامی یا پلانی سەرکەوتووانەی خێزان، کە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، دابەزینی خێرای رێژەی مردنی منالاّن، دەوترێ کە گوایە تەواوی منالاّن ئێستا دەچنە قوتابخانە و رادەی خوێندەواریش لە ماوەی ١٠ سالّدا لە ٤٠٪

بەرزبووەوە بۆ ٧٠٪ (ئەگەر مرۆڤ بڕوا بەئامارە فەرمییەکانی دەوڵەت بکا). زۆر نیشانەی ئابووریش هەن کە ئاماژە بۆ گۆڕانێکی پۆزەتیڤانە دەکەن. کەڵەکەبوونی دراوێکی ئیحتیاتی زۆرتر لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی داهاتی نەوتەوە دەبێتە هۆی ئەوەی ئێران لە بواری دانەوەی قەرزە دەرەکییەکانی خۆیدا (کە کەمن) هیچ جۆرە سەختییەک بەدی نەکات.

## پەراوێزەکان:

(١) هاشمییەکان نەوەی هاشمن، باوکی باپیری محەمەد کە بەشێکن لە قورەیش. مەملەکەتی ئوردونی هاشمی ئەمڕۆ کە سەرۆکەکەی عەبدوڵڵای دووەمە، بەچل پشت دەگاتەوە پێغەمبەر (ن).

(٢) سوننەکان (لە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە هاتووە) زۆرینەی ئیسلام پێک دێنن، بەڵام شیعەکان (کە لە شیعەی عەلییەوە: هەوادارەکانی عەلییەوە هاتووە) کەمینە پێک دێنن و پێیان وایە ئیمامی عەلی کە ئامۆزا و زاوای پێغەمبەرە، دەبوو جێگەی پێغەمبەری بگرتایەوە (ن).

(٣) مەبەست لە Ulama، زانا ئایینییەکان و تیۆلۆگە یاساناسەکانە (ن).

(٤) ڕۆژژمێری ئیسلامی لەو ڕۆژەوە دەست پێ دەکات کە پێغەمبەر لە مەککەوە بەرەو مەدینە کۆچی کردووە (کە دەکاتە ساڵی ٦٢٢ زایینی)، واتە ئەو ساڵە دەکاتە ساڵی ژمارە یەک. لە ئێران هەم ڕۆژژمێری هەتاوی کە سەری ساڵی دەکەوێتە بەهارەوە و هەم ڕۆژژمێری قەمەریش بەکار دێت کە نزیکەی ١١ ڕۆژ لە ساڵی هەتاوی کورتترە. بۆیە ئەو جیاوازییە لە ڕۆژەکاندا دەبینرێ (ن).

(٥) بەر لەوەی ئەم مادەیە بگۆڕدرێت بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

اصل سابق- اصل پنجم در زمان غیبت حضرت ولی عصر، عجل الله تعالی فرجه، در جمهوری اسلامی ایران ولایت امر و امامت امت بر عهده فقیه عادل و با قتوی، آگاه به زمان، شجاع، مدیر و مدبر است، که اکثریت مردم او را به رهبری شناخته و پذیرفته باشند و در صورتی که هیچ فقیهی دارای چنین اکثریتی نباشد رهبر یا شورای رهبری مرکب از فقهای واجد شرایط بالا طبق اصل یکصد و هفتم عهده‌دار آن میگردد.

(٦) لە ڕووی دەستەواژییەوە مرۆڤ دەتوانێ جیاوازی لە نێوان شەریعە و یاسادا بکات. گرنگترین شت بەنیسبەت شەریعەوە ئەوەیە کە یاسای خوایە، قانونیش لە ڕووی ماناوە وا دێتەوە وایە کە لەسەر بنەما یاساییەکان داڕێژراوە (ن).

(٧) دەقی مادەی دووەمی یاسای بنەڕەتی بەم شێوەیەیە:

اصل ٢:

جمهور اسلامی، نظامی است بر پایه ایمان به:

۱- خدای یکتا لا اله الا الله واختصاص حاکمیت و تشریع به او و لزوم تسلیم در بربر امر او.

۲- وحی الهی و نقش بنیادی آن در بیان قوانین.

۳- معاد و نقش سازنده آن در سیر تکاملی انسان به سوی خدا.

٤- عدل خدا در خلقت و تشریع.

٥- امامت و رهبری مستمر و نقش اساسی آن در تداوم انقلاب اسلام.

٦- کرامت و ارزش والای انسان و آزادی توأم با مسئولیت او در برابر خدا، که از راه:

الف - اجتهاد مستمر فقهای جامع الشرایط بر اساس کتاب و سنت معصومین سلام الله علیهم اجمعین.

ب- استفاده از علوم و فنون و تجارب پیشرفته بشری و تلاش در پیشبرد آنها،

ج- نفی هر گونه ستمگری و ستم کشی و سلطه‌گری و سلطه‌پذیری،

قسط و عدل و استقلال سیاسی و اقتصادی و اجتماعی و فرهنگی و همبستگی ملی را تأمین میکند.

(۸) مادەکانی ۹۱ - ۹۹ی یاسای بنەڕەتی ئێران بەشێوەیەکی گشتی باس لەو دەسەڵاتە بەرفراوانە دیکتاتۆریانەی شورای نیگابان دەکات. لەم مادانەدا زۆر بەڕوونی باسی ئەوە کراوە کە بەبێ بوونی ئەم شورایە تەنانەت پەرلەمانیش هیچ جۆرە ئیعتبارێکی نییە. بەهەمان شێوە باس لە پێکهاتە و کارەکانی ئەم شورایە دەکات. دەقی ئەم مادانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

اصل ۹۱:

۱- به منظور پاسداری از احکام اسلام و قانون اساسی از نظر عدم مغایرت مصوبات مجلس شورای اسلامی با آنها، شورایی به نام شورای نگهبان با ترکیب زیر تشکیل میشود:

۱- شش نفر از فقهای عادل و آگاه به مقتضیات زمان و مسائل روز، انتخاب این عده با مقام رهبری است.

۲- شش نفر حقوقدان، در رشته‌های مختلف حقوقی، از میان حقوقدانان مسلمانی که به وسیله رییس قوه قضاییه به مجلس شورای اسلامی معرف میشوند و با رأی مجلس انتخاب میگردند.

اصل ۹۲:

اعضای شورای نگهبان برای مدت شش سال انتخاب می شوند ولی در نخستین دوره پس از گذشتن سه سال، نیمی از اعضای هر گروه به قید قرعه تغییر مییابند و اعضای تازه‌ای به جای انها انتخاب میشوند.

اصل ۹۳:

مجلس شورای اسلامی بدون وجود شورای نگهبان اعتبار قانونی ندارد مگر در مورد تصویب اعتبارنامه نمایندگان و انتخاب شش نفر حقوقدان اعضای شورای نگهبان.

اصل ۹٤:

کلیه مصوبات مجلس شورای اسلامی باید به شورای نگهبان فرستاده شود، شورای نگهبان موظف است آن را حداکثر ظرف ده روز از تاریخ وصول از نظر انطباق بر موازین اسلام و قانون اساسی مورد بررسی قرار دهد و چنانچه آن را مغایر ببیند برای تجدید نظر به مجلس بازگرداند در غیر این صورت مصوبه قابل اجر است.

اصل ۹۵:

در مواردی که شورای نگهبان مدت ده روز را برای رسیدگی و اظهار نظر نهایی کافی نداند، میتواند از مجلس شورای اسلامی حداکثر برای ده روز دیگر با ذکر دلیل خواستار تمدید وقت شود.

اصل ۹٦:

تشخیص عدم مغایرت مصوبات مجلس شورای اسلامی با احکام اسلام با اکثریت فقهای شورای نگهبان و تشخیص عدم تعارض آنها با قانون اساسی بر عهده اکثریت همه اعضای شورای نگهبان است.

اصل ۹۷:

اعضای شورای نگهبان به منظور تسریع در کار میتوانند هنگام مذاکره درباره لایحه یا طرح قانونی در مجلس حاضر شوند و مذاکرات را استماع کنند، اما وقتی طرح یا لایحه‌ای فوری در دستور کار مجلس قرار گیرد، اعضای شورای نگهبان باید در مجلس حاضر شوند و نظر خود را اظهار نمایند.

اصل ۹۸:

تفسیر قانون اساسی به عهده شورای نگهبان است که با تصویب سه چهارم آنان انجام میشود.

اصل ۹۹:

۱- شورای نگهبان نظارت بر انتخابات مجلس خبرگان رهبری، ریاست جمهوری، مجلس شورای اسلامی و مراجعه به آراء عمومی و همه‌پرسی را بر عهده دارد.

(۹) اصل ۱۰۷:

پس از مرجع عالیقدر تقلید و رهبر کبیر انقلاب جهانی اسلام و بنیانگذار جمهوری اسلامی ایران حضرت ایت الله العظمی امام خمینی (قدس سره الشریف) که از طرف اکثریت قاطع مردم به مرجعیت و رهبری شناخته و پذیرفته شدند، تعیین رهبر به عهده خبرگان منتخب مردم است، خبرگان رهبری درباره همه فقهاء واجد شرایط مذکور در اصول پنجم و یکصد و نهم بررسی و مشورت میکنند، هر گاه یکی از آنان را اعلم به احکام و موضوعات فقهی یا مسائل سیاسی و اجتماعی یا دارای مقبولیت عامه یا واجد برجستگی خاص در یکی از صفات مذکور در اصل یکصد و نهم تشخیص دهند او را به رهبری انتخاب میکنند و در غیر این صورت یکی از آنان را به عنوان رهبر انتخاب و معرفی مینمایند رهبر منتخب خبرگان، ولایت امر و همه مسئولیت های ناشی از آن را بر عهده خواهد داشت، رهبر در برابر قوانین با سایر افراد کشور مساوی است.

(۱۰) مادەی ۱۱۰ی یاسای بنەڕەتی بەم شێوەیە باس لە دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکانی ڕابەر دەکات. لە ڕاستیدا ڕابەر هیچ شتێک نەماوە کە بەدەستی نەبێ. دەبێ خوێنەر سەرنجی ئەوە بدات کە نووسەرەکان هەمیشە لەبەر ڕۆشنایی یاسا بنەڕەتییەکەی ساڵی ۱۹۷۹ باس لە شتەکان دەکەن. بەڵام هەندێک لە مادەکان دوای مردنی خومەینی/ریفۆرمی ۱۹۸۹ هەندێک گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە. من لە هەموو پەراوێزەکاندا دەقە تازەکانم نووسیوەتەوە، تەنها لە دوو جێگادا نەبێ کە نووسەرەکان مەبەستیان بووە (مادەی ۵، ۱۱۰) لێرەدا نووسەرەکان لەبەر ڕۆشنایی دەقە کۆنەکەدا باس لە دەسەڵاتەکانی ڕابەر دەکەن. بەڵام دواتر لە ژێر سەردێڕی "ریفۆرمکردنی یاسای بنەڕەتی ۱۹۸۹"دا نووسەرەکان لەبەر ڕۆشنایی دەقە ریفۆرمکراوەکەدا باس لە دەسەڵاتەکانی ڕابەر

دەكەن. بۆیە من لێرەدا هەردوو دەقەكەم نووسیوەتەوە. دەقە كۆنەكەی مادەی ١٠٧: وظایف و اختیارات رهبری:

١- تعیین فقهای شورای نگهبان.

٢- نصب عالیترین مقام قضایی كشور.

٣- فرماندهی كلی نیروهای مسلح به ترتیب زیر.

الف - نصب و عزل رییس ستاد مشترک.

ب- نصب و عزل فرمانده كل سپاه پاسداران انقلاب اسلامی.

ج- تشكیل شورای عالی دفاع ملی، مركب از هفت نفر از اعضای زیر.

- رییس جمهور.

- نخست وزیر.

- وزیر دفاع.

- رییس ستاد مشترک.

- فرمانده كل سپاه پاسداران انقلاب اسلامی.

- دو مشاور به تعیین رهبر.

د- تعیین فرماندهان عالی نیروهای سه گانه به پیشنهاد شورای عالی دفاع.

ه- اعلام جنگ و صلح و بسیج نیروهای به پیشنهاد شورای عالی دفاع.

٤- امضای حكم ریاست جمهور پس از انتخاب مردم صلاحیت داوطلبان ریاست جمهوری از جهت دارا بودن شرایطی كه در این قانون میآید باید قبل از انتخابات به تأیید شورای نگهبان و در دوره اول به تأیید رهبری برسد.

٥- عزل رییس جمهور با در نظر گرفتن مصالح كشور، پس از حكم دیوان عالی كشور به تخلف وی از وظایف قانونی یا رأی مجلس شورای ملی به عدم كفایت سیاسی او.

٦- عفو یا تخفیف مجازات محكومیت، در حدود موازین اسلامی، پس از پیشنهاد دیوان عالی كشور.

ئەمەش دەقە تازەكەیە كە خوێنەر دواتر پێویستی پێی هەیە:

وظایف و اختیرات رهبر

١- تعیین سیاستها كلی نظام جمهوری اسلامی ایران پس از مشورت با مجمع

تشخیص مصلحت نظام.

۲- نظارت بر حسن اجرای سیاستهای کلی نظام.

۳- فرمان همه‌پرسی.

٤- فرماندهی کلی نیروهای مسلح.

٥- اعلام جنگ و صلح و بسیج نیروها.

٦- نصب و عزل و قبول استعفای:

الف - فقه‌های شورای نگهبان.

ب- عالیترین مقام قوه قضاییه.

ج- رییس سازمان صدا و سیمای جمهوری اسلامی ایران.

د- رییس ستاد مشترک.

هـ- فرمانده کل سپاه پاسداران انقلاب اسلامی.

و- فرماندهان عالی نیروهای نظامی و انتظامی.

۷- حل اختلاف و تنظیم روابط قوای سه گانه.

۸- حل معضلات نظام که از طرق عادی قابل حل نیست، از طریق مجمع تشخیص مصلحت نظام.

۹- امضاء حکم ریاست جمهوری پس از انتخاب مردم صلاحیت داوطلبان ریاست جمهوری از جهت دارا بودن شرایطی که در این قانون میآید باید قبل از انتخابات به تأیید شورای نگهبان و در دوره اول به تأیید رهبری برسد.

۱۰- عزل رییس جمهور با در نظر گرفتن مصالح کشور پس از حکم دیوان عالی کشور به تخلف وی از وظایف قانونی، یا رأی مجلس شورای اسلامی به عدم کفایت وی بر اساس اصل هشتاد و نهم.

۱۱- عفو یا تخفیف مجازات محکومیت در حدود موازین اسلامی، پس از پیشنهاد رییس قوه قضاییه.

رهبر میتواند بعضی از وظایف و اختیارات خود را به شخص دیگری تفویض کند.

(۱۱) اصل ٤:

کلیه قوانین و مقررات مدنی، جزایی، مالی، اقتصادی، اداری، فرهنگی،

نظامی، سیاسی و غیر اینها باید بر اساس موازین اسلامی باشد این اصل بر اطلاق یا عموم همه اصول قانون اساسی و قوانین و مقررات دیگر حاکم است و تشخیص این امر بر عهده فقهاء شورای نگهبان است.

(١٢) اصل ١٢:

دین رسمی ایران، اسلام و مذهب جعفری اثنیعشری است و این اصل الی الابد غیر قابل تغییر است و مذاهب دیگر اسلامی اعم از حنفی، شافعی، مالکی، حنبلی و زیدی دارای احترام کامل میباشند و پیروان این مذاهب در انجام مراسم مذهبی، طبق فقه خودشان آزادند و در تعلیم و تربیت دینی و احوال شخصیه ازدواج، طلاق، ارث وصیت و دعاوی مربوط به آن در داگاهها رسمیت دارند و در هر منطقهای که پیروان هر یک از این مذاهب اکثریت داشته باشند، مقررات محلی در حدود اختیارات شوراها بر طبق آن مذهب خواهد بود، با حفظ حقوق پیروان سایر مذاهب.

(١٣) مەبەست لە madhhab کۆ madhahib، ئەو ئایینزایانەیە کە لە ئیسلامدا هەن و هەربەکەیان بەناوی داهێنەرەکانیانەوە ناونراون (ن).

(١٤) مادەی ٦٤ باس لە نمایندەگی پەرلەمانی پەیڕەوانی ئایینەکانی تر دەکات.

اصل ٦٤:

عده نمایندگان مجلس شورای اسلامی دویست و هفتاد نفر است و از تاریخ همهپرسی سال یکهزار و سیصد و شصت و هشت هجری شمسی پس از هر ده سال، با در نظر گرفتن عوامل انسانی، سیاسی، جغرافیایی و نظایر آنها حداکثر بیست نفر نماینده میتواند اضافه شود زرتشتیان و کلیمیان هر کدام یک نماینده و مسیحیان اشوری و کلدانی مجموعا یک نمایند و مسیحیان ارمنی جنوب و شمال هر کدام یک نماینده انتخاب میکنند.

محدوده حوزههای انتخابیه و تعداد نمایندگان را قانون معین میکند.

(١٥) من بەش بەحاڵی خۆم وا لەم دێرە تێ دەگەم کە موسڵمانەکان تەنها بۆیان هەیە کاندیدێکی موسڵمان هەڵبژێرن. بەهەمان شێوە جووەکان کاندیدی جو و مەسیحییەکان کاندیدی مەسیحی و... هتد. واتە یەکێکی موسڵمان بۆی نییە کاندیدێکی جو هەڵبژێرێ یا بەپێچەوانەوە.

(١٦) واتە تەنها ئایدیۆلۆژی ئیسلام هەیە و ڕێگە نادرێ هیچ ئایدیۆلۆژییەکی دیکە

هەبێ. بۆیەشە ڕێگە بەحیزبەکان نادرێت کە وەکو حیزب بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن چونکە کە یەک ئایدیۆلۆژیا هەبوو چیتر پێویست بەوە ناکا گروپ و حیزبە جوداکـان بەربەرەکـانی لەگـەڵ یەکـتـردا بکەن چونکە دەبێ بڕوایان بەهەمـان ئایدیۆلۆژیای هەبێ و بۆ هەتا هەتاییش.

(١٧) واتە ڕاگرتنی بڕیار و یاساکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، نەک هەڵوەشانەوەیان.

(١٨) بەپێی مادەی ١١٢ ئەم دەزگایە کە ڕەفسنجـانی سەرۆکایەتی دەکرد دەسەڵاتێکی یەکجار گەورەی خرایە ژێر دەستەوە، ئەویش یەکـالاکـردنەوەی ناکـۆکـییەکـانی نێوان پەرلەمـان و شورای نیگابانە. لە سەرجەمی ولاتە پێشکەوتووەکاندا ئەم کارە دادگای بالا یا دەستووری دەیکات. چ ئەم دەزگایە و چ شورای نیگابانیش ئەگەر نەڵێین هەمیشە ئەوە بەزۆری هەر لە دەستی کۆنسێرڤاتیڤەکاندا بووە:

اصل ١١٢

مجمع تشخیص مصلحت نظام برای تشخیص مصلحت نظام در مواردی که مصوبه مجلس شورای اسلامی را شورای نگهبان خلاف موازین شرع و یا قانون اساسی بداند و مجلس با در نظر گرفتن مصلحت نظام نظر شورای نگهبان را تأمین نکند و مشاوره در اموری که رهبری به انان ارجاع میدهد و سایر وظایفی که در این قانون ذکر شده است به دستور رهبری تشکیل میشود.

اعضاء ثابت و متغیر این مجمع را مقام رهبری تعیین مینماید مقررات مربوط به مجمع توسط خود اعضاء تهیه و تصویب و به تأیید مقام رهبری خواهد رسید.

(١٩) اصل ١٦٧:

قاضی موظف است کوشش کند حکم هر دعوا را در قوانین مدونه بیابد و اگر نیابد با استناد به منابع معتبر اسلامی یا فتاوای معتبر، حکم قضیه را صادر نماید و نمیتواند به بهانه سکوت یا نقص یا اجمال یا تعارض قوانین مدونه از رسیدگی به دعوا و صدور حکم امتناع ورزد.

(٢٠) مەبەست لەو دیارییەیە کە زاوا بەیانی زوو دەیداتە بووک، پاش ئەوەی شەوی یەکەمی لەگەڵدا بەسەر برد. ئەمە جۆرە نەریتێکە کە لە هەندێ ولاتدا پیادە دەکرێ.

(٢١) اصل ١٠:

از آنجا که خانواده واحد بنیادی جامعه اسلامی است، همه قوانین و مقررات و برنامه ریزیهای مربوط باید در جهت آسان کردن تشکیل خانواده، پاسداری از قداست ان و استواری روابط خانوادگی بر پایه حقوق و اخلاق اسلامی باشد.

اصل ۱۱:

به حکم آیه کریمه "ان هذه امتکم امة واحدة وانا ربکم فاعبدون" همه مسلمانان یک امت اند و دولت جمهوری اسلامی ایران موظف است سیاست کلی خود را بر پایه إئتلاف و اتحاد ملل اسلامی قرار دهد و کوشش دیر به عمل آورد تا وحدت سیاسی، اقتصادی و فرهنگی جهان اسلام را تحقق بخشد.

(۲۲) بەپێی ئایەتی ۳۳ی سورەتی المائدە سزای ئەوانەی شەڕ لەگەڵ خوا و پێغەمبەرەکانی خوادا دەکەن و فەساد لەسەر زەویدا بڵاو دەکەنەوە کوشتن و هەڵواسین و دەست و قاچ بڕینەوەیە - و.

دەقی ئایەتەکە بەم شێوەیەیە:

"إنما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله ويسعون في الارض فسادا أن يقتلوا أو يصلبوا أو تقطع أيديهم وأرجلهم من خلف أو ينفوا من الارض ذلك لهم خزي في الدنيا ولهم في الاخرة عذاب عظيم".

(۲۳) بەپێی ئەم مادەیە بووایە ئەوە نەدەبوو ئازار و ئەشکەنجەدان لە ئێراندا هەبووایە:

اصل ۳۳:

هر گونه شکنجه برای گرفتن اقرار و یا کسب اطلاع ممنوع است. اجبار شخص به شهادت، اقرار یا سوگند، مجاز نیست و چنین شهادت و اقرار و سوگندی فاقد ارزش و اعتبار است متخلف از این اصل طبق قانون مجازات میشود.

(٢٤) سەرجەمی ئەو حیزبانەی لە ناو ئێران و کوردستاندا بوون و لەگەڵ دەوڵەتدا نەبوون ناچار کران ناو شار بەجێ بێڵن و ڕوو لە چیاکان یا لە دەرەوەی ئێران بکەن. مجاهدین خلق پاش ماوەیەک لە پەرتەوازەبوون ڕووی لە عێراق کرد. ئەم حیزبە بارەگای گەورەی لە ناو شارەکانی کوردستاندا هەبووە. دەوڵەتی عێراق زرنگانە توانی بۆ مەبەست و پیلانەکانی خۆی بەکاریان بێنێ، بۆ نموونە لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکاندا. ئەوەی پەیوەندی بەکوردەوە هەبێ ئەوەیە کە مجاهدین چەندین جار دەستی لە کوشتن و سەربڕینی خەڵکی کورددا هەبووە. خەڵکی ئاسایی ئەوە دەگێڕنەوە کە لە کاتی ڕاپەڕینی بەهاری ۱۹۹۱دا

بەبەرچاوی خۆیانەوە ئەندامەکانی ئەم حیزبەیان دیوە کە چەندین کوردیان کوشتووە. بەڵگەنامەکانی دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس بەشێک لەم ڕاستیانەیان ئاشکرا کرد.

(٢٥) لەم بوارەدا ڕژێمی ئێران و عێراق بەیەک ئاراستەدا گوزەر دەکەن. لە هەردوو لا ڕژێمی ئیسلامی و بەعسی خۆیان هاوێشتوّتە نێو تەواوی دامودەزگاکانی وڵاتەکەوە و دەستیان بەسەر سەرجەمی دەزگا گرینگەکاندا گرتووە. بۆ پتەوکردنی ئەمەش هەربەکە و هەزارەها ئەندامیان کۆکردۆتەوە کە لە ئێران لە شێوە کۆمیتە و پاسداران و... هتد دایە، لە عێراقیشدا لە شێوەی ئەمن و موخابەرات و حیزب... هتد دایە. لە زۆربەی دامودەزگاکاندا لە ئێران کۆلکە مەلایەک و لە عێراقدا بەعسییەکی بێ فەرِ کە خاوەنی پلەیەکی نزمن لە ناو ئیدارەکاندا، دەسەڵاتی تەواویان تەنانەت بەسەر بەڕێوەبەر و سەرۆکی ئیدارەکانیشدا هەیە.

(٢٦) اصل ٢٤:

نشريات و مطبوعات در بيان مطالب آزادند مگر آن كه مخل به مبانى اسلام يا حقوق عمومى باشد، تفصيل آن را قانون معين ميكند.

(٢٧) مادەی ١٧٥:

در صدا و سيماى جمهورى اسلامى ايران، آزادى بيان و نشر افكار با رعايت موازين اسلامى و مصالح كشور بايد تأمين گردد.

نصب و عزل رييس سازمان صدا و سيماى جمهورى اسلامى ايران با مقام رهبرى است و شورايى مركب از نمايندگان رييس جمهور و رييس قوه قضاييه و مجلس شوراى اسلامى هر كدام دو نفر نظارت بر اين سازمان خواهند داشت.

خط مشى و ترتيب اداره سازمان و نظارت بر آن را قانون معين ميكند.

(٢٨) مەبەست لەو یاسایانەیە کە هەم جۆرە ئازادییەک بۆ هاوڵاتییەکان بەرقەرار دەکا و هەم لە دەستدرێژی هاوڵاتییەکانی تر یا کۆمەڵگاش دەیانپارێزێ.

(٢٩) لە پەراوێزی ژمارە ١٢دا مادەی ١٢ دانراوە، وا لە خوارێشەوە مادەی ١٣ و ١٤ی یاسای بنەڕەتی دادەنێم:

مادەی ١٣: باس لە مافی زەردەشتەکان، جوەکان و کریستەکان دەکات.

ايرانيان زرتشتى، كليمى و مسيحى تنها اقليتهاى دينى شناخته مى شوند كه

در حدود قانون در انجام مراسم دینی خود آزادند و در احوال شخصیه و تعلیمات دینی بر طبق آیین خود عمل میکنند.

مادەی ١٤: باس له ڕێزگرتنی غەیره موسڵمانەکان دەکات له لایەن موسڵمانەکانەوە:

به حکم آیه شریفه "لاینهاکم الله عن الذین لم یقاتلوکم فیالدین ولم یخرجوکم من دیارکم ان تبروهم و تقسطوا الیهم ان الله یحب المقسطین" دولت جمهوری اسلامی ایران و مسلمانان موظفند نسبت به افراد غیر مسلمان با اخلاق حسنه و قسط و عدل اسلامی عمل نمایند و حقوق انسانی آنان را رعایت کنند این اصل در حق کسانی اعتبار دارد که بر ضد اسلام و جمهوری اسلامی ایران توطنه و اقدام نکنند.

(٣٠) اصل ٢٣:

تفتیش عقاید ممنوع است و هیچکس را نمیتوان به صرف داشتن عقیدەای مورد تعرض و مواخذه قرار دارد.

## سەرچاوەکان:

Ahmed, Ishtiaq: The Concept of an Islamic State. An Analysis of the ideological Controversy in Pakistan. Stockholm, 1985.

Bakhash, Shaul: The Reign of the Ayatollahs. Iran and the Islamic Revolution. New Yourk, 1984.

Bashiriyeh, Hossein: The State and Revolution in Iran 1962 - 1982. London, 1982.

Brumberg, Daniel: Reinventing Khomeini. The Struggle for Reform in Iran. Chicago and London 2001.

Chubin, Shahram: Whither Iran? Reform Domestic Politics and National Security. Adelphi Papers, 342. London 2002.

Dahle'n Ashk: Deciphering the Meaning of Revealed Law. The Surûshian Paradigm in Shi'i Epistemology. Uppsala, 2001.

Ehteshami, Anoushirvan: After Khomeini: The Iranian Second Republic. London, 1995.

Ende, Werner: Arabische Nation und Islamische Geschichte. Die Umayyaden in Utreil arabischer Autoren des 20. Jahrhunderts. Beirut / Wiesbaden, 1977.

Esposito, John and Ramazani, R. K (red): Iran at the Crossroads. New York, 2001.

Ferdinand, Klaus och Mozaffari, Mehdi (red): Islam: state and Society. NIAS, 1988.

Gavahi, abdolrahim: Islamic Revolution of Iran. Conceptual Aspects and Religious Dimension. Uppsala, 1987.

Hiro, Dilip: Iran under the Ayatollahs. 1987.

Hjärpe, Jan: Politisk islam: Studier I muslims fundamentalism. Andra upplagan. Stockholm, 1983.

Hooglund, Eric (red): Twenty Years of Islamic Revolution. Political and Social Transition in Iran since 1979. Syracuse, 2002.

Johnsson, Bo: Islamisk rätt: Studier I den islamiska iätt - och samhällsordningen. Stockholm, 1975.

Keddie, Nikki R. och Hooglund (red): The Iranian Revolution and the Islamic Republic. Boulder, Col, 1986.

Kepel, Gilles: Jihad. Expansion et de'clin del islamisme. Paris, 2000.

Martin, Vanessa: Women, Religion and Culture in Iran. Richmond, 2002.

Martin, Vanessa: Creating an Islamic State. Khomeini and the making of a New Iran. London, 2003.

Menashri, David: Iran. Adecade of War and revolution. New York and London. 1990.

Nordberg, Michael: Profetens folk. State samhälle och kultur I islam under 1000 ar. Stockholm, 1988.

Schacht, Joseph: An Introduction to Islamic Law. Oxford, 1979.

Schirazi, Ashga: The Constitution of Iran. Politics and the State in the Islamic republic. London, 1997.

Utas, Bo: Islam og samfundet. Köpenhamn, 1982 / textsamling.

Vakili, Valla: The Political Thought of Abdolkarim Sorerish. New York, 1996.

Vatikiotis, Panayotis: Islam and the state. London, 1987.

* بۆ بەدواداچوونی تێرم و دەستەواژە ئیسلامییەکان و ماناکانیان، هەروەها تێکست و سەرچاوەکان بڕوانە:

Encyclopaedia of Islam. New York (London/ Leiden)

and

Shorter Encyclopaedia of Islam. (D: o).

* بۆ بەدواچوونێکی بەردەوامی هەواڵەکانی ئێران بڕوانە:

Discours. An Iranian Quarterly. Tehran. 1999.

# پێرست